پرۆژەی توێژینەوە جیهانییەکان
بەشی سێیەم

24



# بازرگانیکردن
## بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ



جیهاد موسا قنام - فاطمة صالح الشمالي

وەرگێڕانی: وەرگێڕانی: کارناس جوبرائیل

IDEA FOUNDATION
دەزگای ئایدیا
2018

دەزگای ئایدیا بۆ فکرو
لێکۆڵینەوە

خاوەنی ئیمتیاز: دەزگای ئایدیا
لێپرسراوی دەزگا: ئەنوەر حسێن

پرۆژەی توێژینەوە جیهانییەکان- بەشی سێیەم-
سەرپەرشتیار: سابیر عەبدوڵڵا کەریم



# بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

جیهاد موسا قنام

فاطمة صالح الشمالي

وەرگێڕانی: کارناس جوبرائیل
2018

24

سەرپەرشتیارانی پرۆژەی چاپکردنی کتێب

ئەرسەلان حەسەن          بابان ئەنوەر

# بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

ناوی نووسەر: جیهاد موسا قنام - فاطمة صالح الشمالي

وەرگێڕانی: کارناس جوبرائیل

دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەمەد

پێداچوونەوەی زمانەوانی: کارا فاتیح

هەڵەچن: نیاز کەمال- کەیوان عومەر- ئاسان عەبدوڵڵا

تیراژ: 500 دانە

ساڵی چاپ: 2018

چاپ: چاپخانەی حەمدی

نرخ: 3000 دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( [illegible] )ی ساڵی 2018ی پێدراوە

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا

زنجیرە (281 )

www.ideafoundation.co

2018idea@gmail.com

www.facebook.com/dezgai.idea

07705996990 - 0533220180

سلێمانی - گردی سەرچنار- نزیک کۆمەڵگەی بەهاران



# بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ


جیهاد موسا قنام

فاطمة صالح الشمالي



وەرگێڕانی: کارناس جوبرائیل

2018

24

# پێڕست


پێشەکی.................................................................15

پێناسەی تاوانی بازرگانیکردن بە جەستەی مرۆڤ......19

هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی تاوانی بازرگانیکردن........27

کێڵگەکانی تاقیکردنەوەی زانستی و..............................37

کاریگەری و لێکەوتە ئابووری و....................................63

کاریگەرییەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی..................71

بەرپرسیاریێتیی سزایی لە بەرانبەر تاوانی...................83

بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ وەک......101

ڕێگە و میکانیزمەکانی ئەنجامدانی تاوانی..................113

بنەما گشتییەکانی تاوانی بازرگانیکردن بە................119

نەزانی و پەلەپەلکردن لە کاتی بەخشینی ئەندامەکاندا....139

مێژووی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ...153

کاریگەریی بازرگانیکردنی ئەندامانی...........................175

فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە........................209

## پرۆژەی توێژینەوەی جیهانییەکان بۆچی؟

توێژینەوەی جیهانی زنجیرەیەک نامیلکەی تایبەتە بە رووداو، ئاڵوگۆڕ، کێشە، قەیران، پەرەسەندنە سیاسی و ئابورییەکانی جیهان، کە ناوەندە سیاسی و ئابورییە زەبەلاحەکانی بەخۆیەوە سەرقاڵکردووەو بەردەوام لێکۆڵینەوەی وردو زانستی و ئاکادیمییان لەسەر دەکرێت، بەمەبەستی باشتر درککردن بەقەیرانەکان و دۆزینەوەی ڕێگاچارەی گونجاو بۆ چارەسەر، یان زاڵبوون بەسەریاندا. پرۆژەی توێژینەوە جیهانییەکان یەکێکە لە

پڕۆژەکانی تازەکانی دەزگـای ئایدیا بۆ فکرو لێکۆڵینەوە. بەشی یەکەم و دووەمی توێژینەوە جیهانییەکان چاپ و بڵاوکراوەتەوە و ئێستاش بەشی سێیەمی توێژینەوەکانی بۆ خوێنەرانی بەڕێز بـڵاودەکاتـەوە، کە بە شێوەیەکی وردو ڕۆچوونی ئەکادیمییانە گرنگیی داوە بە دیارترین گۆڕانکارییە نێودەوڵەتییەکان.

ڕوداوە سیاسییەکان ئاڵوگۆڕە ئابورییەکان، پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ لە هەر کوچە و سوچێکی ئەم جیهانەدا، کاریگەرییان لەسەر کۆی سیستەمە سیاسییە لۆکاڵ، یان گلۆباڵەکان دروستکردووە. جا هەندێک لـەوانـە سروشتی یـان خۆرسکن هەندێکیشیان بەهۆی دەخالەتی وڵاتانی زلهێزی سیاسی و ئابوری و سەربازییەوە ڕوودەدەن (لە بابەتی پیلانگێڕی، کودەتای سەربازی، تێڕوانینی چاوچـنـۆکـانـەی ئـابـوری و سـەرمـایـەداری و ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەوترێت بازرگانییە نایاسایی و قەدەغەکراوەکان و بەکاڵاکردنی مرۆڤ) یان بـە ئـارمـان و ئامانجی سیاسی جـۆراوجـۆرە لەماوەی سەد ساڵی ڕابـردوودا، لەسەر گۆی زەوی گەواهی ئاڵوگۆڕی چـاوەڕوانـکـراو، یان

چاوەڕواننەکراو بووبن، کە هەندێکیان خزمەتی مرۆڤایەتییان کردووە و هەندێکیشیان بوونەتە هۆی شەڕو کوشتاری بێ ئامان و ماڵوێرانکەر، کە بە ملیۆنان مرۆڤ گیانیان لەدەستداوە.

جیهان لەسەر دەستی زلهێزەکان و کارتێلە گەورەکانی بواری سەرمایە، وزە، نەوت، سەربازی و هەژمونی وڵاتانی خۆرئاوای سەرمایەداری، ئەوانەو هەژاری و نەداری و سیستمی تۆتالیتارو میلیتاریستی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە ئاسیا، ئەفەریقاو وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئەوروپای کۆن و بەشێک لەوڵاتانی ئەمەریکای لاتین، پڕە لەجینایەت و کردەوەی دڕندانەی سەرکوت و داپڵۆسین و لەسێدارەدان و کودەتای سەربازی و برسیکردن و هەژارتربوونی هەژارەکان و سیستمی زاڵی دیکتاتۆرییەت و ژیانی مەمرەو مەژی.

پاشماوەکانی جەنگی ساردی نێوان بلۆکی سەرمایەداری و سۆسیالیستی هێشتا ئاسەواری بەسەر جیهاندا ماوەو تادێت وڵاتانی جیهان زۆرترو زیاتر خۆیان پڕ چەک دەکەن و لەهەوڵی بەدەستهێنانی چەکی ناوەکی و ئەتۆمی زیاتردان

و کۆمپانیاکانی چەک فرۆشتن رۆژانە مۆدێلی نوێ و تازەتری چەک و فرۆکەو کەشتیگەلی مەترسیدارو گرانبەها دەخەنە بازاڕی ململانێوە.

لەسەر ئاستی جیهان فایلی گەرم وگوڕو پڕ کێشەو قەیران بەردەوام روودەدەن و دووبارە دەبنەوە بە بابەتی (شەڕی نیمچە کیشوەری هندستان و پاکستان) کێشەو ململانێی نێوان سریلانکاو پڵنگەکانی تامیل بەکێشەو هەژاری لە بەنگلادیش، شەڕی گروپە ئیسلامییە رادیکاڵەکانی ئەفغانستان، کشمیری پڕ لە پشێویی هندو پاکستان و چین درێژەی هەیە.

لە ئاسیا، ئەفەریقا شەڕو کوشتاری هێزە شیعی و سوننیەکان لەعێراق، یەمەن، سوریا، ئەفغانستان و لوبنان تادێت ژمارەی کوژراو قوربانییەکان روو لەزیادبوون دەکات لەسەر دەستی گروپە ئیسلامییە رادیکاڵ و فەندەمێنتاڵەکان، کە لەلایەن عەرەبستانی سعودیە، قەتەر، تورکیاو کۆماری ئیسلامی ئێران هاوکاری و باربوو دەکرێن و بەریانداوەتە گیانی یەکترو هەر ئەم گروپە ئیسلامییانەن بوونەتە مایەی شەڕو کوشتار و جەنگێکی ماڵوێرانکەر لە

عێراق، ئەفغانستان و فەلەستین و مالی نەیجیریاو تادەگاتە رادەی ئاستی مەترسی تیرۆرو کوشتار لە پاریس، واشنتۆن، رۆما، لەندەن و مەدرید.

هێشتا فرۆکەکانی ولاتانی زلهێزو ژێر دەریایی و کەشتیگەل و بنکە سەربازییەکانیان لەمسەر بۆ ئەوسەری جیهان دەفڕن و باشتر دادەمەزرێن و هەڕەشەی زۆرترو زیاتر لەجیهان دەکەن و بەردەوام دوکەڵی بۆمبەکانیان بەسەر ئاسمانی ولاتانی هەژارو بێ دیفاعی خۆرهەلاتی ناوەڕاست رەش دەچێتەوە. ئەم زنجیرە نامیلکەیە، ئاشناکردنی خوێنەری کوردە بەو روداوانەی کە بیەوێت یان نەیەوێت، کاریگەری لەسەر رەوشی سیاسی کوردستان جێدەهێڵن.

دەزگای ئایدیا ئەم هەنگاوەی لەو پێناوەدایە، کە خوێنەری کورد ئاشنابکات بەو ئاڵوگۆڕە باش و خراپانە و ڕوانگە و تێڕوانینی فراوانتر بکات، کە جیهان بە تەنها بریتی نییە لە ڕوداوگەلێک کە لەناو خۆمان یان لە دەوروبەرمان دەگوزەرێت. بەو ئومێدەی ئەم زنجیرە نامیلکەیەی دەزگا ئایدیا هەوڵێک بێت بۆ دانانی کاریگەری باشتر تێگەیشتن لەو روداوانەی لەجیهاندا دەگوزەرێن.

**بەشی یەکەمی توێژینەوەی جیهانی (1ـ 10)**

| ژمارە | ناوی توێژینەوە | ناوی نوسەر | ناوی وەرگێر | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|---|
| 1 | سیگۆشەی گرگرتوو | ولیام داریمپل | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2016 |
| 2 | دەروازەیەک بۆ ناسینی جەنگی عێراق - کوەیت | هەلگورد جەلال | / | 2016 |
| 3 | گەشتی دوورو درێژی ئەتومی ئێران تێچوون و مەترسییەکانی | عەلی فائیز – کەریم سەجادپور | سۆران عەلی | 2016 |
| 4 | چەتەکانی دەریا لە باشوری خۆرهەلاتی ئاسیا، خۆرئاوای ئەفریقیاو سۆماڵ | مارتن میرفی | هەلگورد جەلال | 2016 |
| 5 | خەبات لەپێناو فرەییدا دوای شۆرشەکانی باکوری ئەفریقیا | ئەنتۆنی دۆرکن | سۆران عەلی | 2016 |
| 6 | جولانەوەی ئەمازیغی و دینامیکیای ژیانی سیاسی لیبیا | بیلال عەبدوڵلا | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2016 |
| 7 | نەوت و گازی شیلی ئەمەریکاو ئاکامە جیۆپۆلۆتیکەکانی | بەهزاد ئەحمەدی لفورکی – مەسعود درەخشان | ئەرسەلان حەسەن | 2016 |
| 8 | کۆچ لە جیهانێکی بێئۆقرەدا | ئەلشیخ بای ئەلحەبیب – رەشید خەشانە | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2016 |

| 9 | تیرۆر، تیرۆریزم و تیرۆریزمی نێودەوڵەتی | د.عەلیرەزا سەمیعی ئیسفەهانی – عەبدولکەریم سالکی | ڕیباز مستەفا | 2016 |
|---|---|---|---|---|
| 10 | چین و سیستەمی بازرگانی جیهانی | ئادیتیا ماتو – ئارڤیند سوبرامانیان | بابان ئەنوەر | 2016 |

**بەشی دووەمی توێژینەوە جیهانییەکان (11 – 20)**

| ژمارە | ناوی توێژینەوە | ناوی نوسەر | ناوی وەرگێر | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|---|
| 11 | پاکستان و گۆڕانکارییەکانی ناوخۆو دەرەوە | کۆمەڵێک نوسەر | بابان ئەنوەر | 2017 |
| 12 | پەیوەندییەکانی ئێران و هندستان | یەدوڵلا دهقان – مەهدی کازمی | ماجید خەلیل | 2017 |
| 13 | چین و ئێران | د.فهد مزبان خزار – منوشهر دوراج – مایکل سینگ | محەمەد چیا | 2017 |
| 14 | ژنان لە بەهاری عەرەبیدا | کۆمەڵێک نوسەر | ئەرسەلان حەسەن | 2017 |
| 15 | سیستەمی نێودەوڵەتی هێز یان دادپەروەری | هاکان ئالتینای | ئارام مەحمود ئەحمەد | 2017 |
| 16 | ڕکابەری ئەمەریکاو ئێران لە ئەمەریکای لاتین و ئەفەریقیا | براندۆن فایت – کلۆی کوگلین – شولت – | کۆشان عەلی زەمانی | 2017 |
| 17 | کاریگەرییەکانی دابەزینی نرخی نەوت | ڕاپۆرتی وەرزیی بانکی نێودەوڵەتی | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2017 |

| 18 | پێگەی ئێران لە خۆرهەڵات ناوەڕاستدا | بەختیار ئەحمەد ساڵح | / | 2017 |
|---|---|---|---|---|
| 19 | مۆریتانیا وڵاتێکی دەرەوشاوەی کەنارو بیابان | ئەنوار بوخرس | شاناز هیرانی | 2017 |
| 20 | هەرێمی کوردستان و ملمڵانێ ناوچەییەکان | ئەنوەر حسێن (بازگر) | / | 2017 |

**بەشی سێیەمی توێژینەوە جیهانییەکان (21 – 30)**

| ژمارە | ناوی توێژینەوە | ناوی نوسەر | ناوی وەرگێڕ | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|---|
| 21 | بازرگانیکردن بە ژنان | کۆمەڵێک نوسەر | شاگول عەبدولڕەحمان | 2018 |
| 22 | بازرگانیکردن بە منداڵان | د. سرور قارونی – خالد بن محمد ئەلمەرزوق | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2018 |
| 23 | بازرگانیکردن بە مادده هۆشبەرەکان | کۆمەڵێک نوسەر | ئارام مەحمود ئەحمەد | 2018 |
| 24 | بازرگانیکردن بە چەک | نیکۆلاس جیربای | هەڵگورد جەلال | 2018 |
| 25 | بازرگانیکردن بە ئاڵتوون | کۆمەڵێک نوسەر | ماجد خەلیل | 2018 |
| 26 | بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ | جیهاد موسا قنام – فاطمهة الشمالي | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2018 |
| 27 | بازرگانیکردن بە دەرمان | کۆمەڵێک نوسەر | شاناز ڕەمزی هیرانی | 2018 |
| 28 | بازرگانیکردن بە ئاسەوارەکان | کۆمەڵێک نوسەر | کارناس جوبرائیل | 2018 |
| 29 | بازرگانیکردن بە یۆرانیۆم | د. مەحموود بەرەکات – رومیسا خولابی | سابیر عەبدوڵلا کەریم | 2018 |
| 30 | بازرگانی سپیکردنەوەی پارە | کۆمەڵێک نوسەر | شاناز ڕەمزی هیرانی | 2018 |

## پێشەکی

جەستەی مـرۆڤ، هـەر مرۆڤێک خاوەنی پیرۆزی و شکۆی خۆیەتی، کە وای کردوە هەر جۆرە ڕێکەوتن یان سەودایەک بۆ فرۆشتنی ئەو جەستەیە، یان فرۆشتنی هەر ئەندامێکی یان دەمارێکی کارێکی نەشیاو و پووچ بێت، بەڵکوو ئەو کارە بە پێی ڕێسا و شەریعەتە ئاسمانییەکان ڕووبەڕووی لێپرسینەوەی جەزایی دەکرێتەوە، ئەمەیش لـە هـەمـوو دەسـتـوور و یاساکاندا لە سەرجەم دەوڵەتانی جیهان داڕێـژراوە و پەسەند کراوە، لە پاڵ پەیماننامە و ڕێکەوتنە نێودەوڵەتییەکاندا و سزای بەرپەرچدەری بۆ دانراوە، تا جەستەی مرۆڤ نەکرێتە هاوشێوەی شمەک و کاڵایەک، کە کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکـرێـت، بـەڵام ئـەگـەر بێتو ئـەم کـارە ڕوو بدات دەبێتە مەترسییەک و هەڕەشە لە توخم و جۆری مرۆڤایەتی دەکـات و زیانی زۆری لێ دەکەوێتەوە و شکۆی مرۆڤایەتی لەکەدار دەکـات. ئـەم مەترسییانە لـەگـەڵ زۆربـوونـی باند و گرووپی تایبەتمەند بە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ زیاد دەکـات، ئیتر

ئەگەر ئەوانە پزیشکەکان بن یان دەڵاڵ و هەندێک نەخۆشخانەی تایبەت بن لە وڵاتەکان.

ئەو گەشەسەندن و پێشکەوتنەی لە بواری زانستەکانی پزیشکیدا بە دی هاتوە ڕۆڵێکی گەورەی گێڕاوە لە سەرهەڵدانی چەندین شێوازی مەترسیدار، کە هەق وایە ببێتە زادەی ئەنجامدانی چەندین توێژینەوەی یاسایی جددی، چونکە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ یەکێکە لە گرینگترین کارە نایاساییی و قەدەغەکراوەکان لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی، چونکە پێچەوانەی مافی مرۆڤ و مرۆڤایەتییە بە گشتی. پێویستی نەخۆشەکانی بە هیوایەک هەمیشە لە ناو دڵ و دەروونیاندا هەیە لە لایەک، پێویستی مرۆڤە هەژارەکانیش بۆ بڕێک دارایی کە سکی برسیانی پێ تێر بکەن لە لایەکی ترەوە، هەمووی چەند بارودۆخێکە وای کردوە زەمینە بۆ کەسانی هەلپەرست و ناخنەخۆش خۆش بێت تا ئەم جۆرە تاوانانە ئەنجام بدەن، کە لە ڕابردوودا نەبوون. بەم شێوەیە چەندین باند و تۆڕی تاوانکاریی ڕێکخراو دروست بوون،

جگە لەوەیش ڕێڕەوی کاری پزیشکی گۆڕاوە و نەشتەرگەرییەکانی گواستنەوە و چاندنی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ لە پرسێکی مرۆڤایەتییەوە، کە ئامانج لێی کەمکردنەوەی ئازار و مەینەتییەکانی کەسانی نەخۆشە، گۆڕا بۆ بازرگانییەکی ڕەش و پڕ لە ناپاکی و بێویژدانی، ئەم کارەیش لە لایەن کەسانێکەوە ئەنجام دەدرێت، کە لە جیاتیی پاراستنی متمانەیان، بەڵام ویژدانیان لە بەرانبەر مشتێک پارەدا دەفرۆشن.

### گرینگیی ئەم توێژینەوەیە

لە ڕاستیدا لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە سەر بابەتی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە پێناو هەوڵدان بۆ قەدەغەکردن و سەرکۆنەکردنی، لە گرینگیی شکۆ و کەرامەتی مرۆڤایەتیدا خۆی دەبینێتەوە، چونکە خودای گەورە ڕێزی لە مرۆڤ گرتوە و لە تەواوی دروستکراوەکانی تری جیا کردوەتەوە و داوای کردوە تا پارێزگاری لە لەش و جەستە وماڵەکەی بکرێت لە بەرانبەر هەر دەستدرێژییەک.

سەبارەت بەم بابەتە گرینگە خودا فەرموویەتی:
«ولا تقتلوا النفس التي حرم الله الا بالحق»،
هەر لەبەر ئەم گرینگیپێدانەیش داڕێژەرانی
یاسا سزایەکیان دیاری کردوە بۆ هەر کەسێک
بیەوێت زیان بە سەلامەتیی جەستەی مرۆڤ
بگەیەنێت و لە شکۆ و هەیبەتی کەم بکاتەوە،
ئەمەیش لە یاسا و ڕێسا و ڕێکەوتننامە
نێودەوڵەتییەکاندا پێداگری لە سەر کراوە و
پشتڕاستیان کردوەتەوە.

## ماهیەتی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و لێکەوتە یاساییەکەی

لە ڕاستیدا پێناسەکردن و دەربڕینی
دەستەواژە و چەمکە سەرەکییەکان لە ڕووی
ئەکادیمییەوە بۆ هەر توێژینەوەیەک کارێکی
گرینگە. سەرەتا پێویستە لە سەرمان بە
دیاریکراوی ئاماژە بەوە بکەین، کە ئایا مەبەست
لە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ
چییە، کە زیاتر لە پێناسەیەک یان لێکدانەوەیەک
هەڵدەگرێت.

## پێناسەی تاوانی
## بازرگانیکردن بە جەستەی مرۆڤ

یاسادانەران وەک هەر بابەتێکی تر پێناسەی ئەندامی جەستەی مرۆڤیان نەکردوە، بەڵکوو پیاوانی یاسا زۆر وردتر پێناسەیان کردوە لە ڕووی گونجاندنی لە بواری بەرپرسیارێتیی جینائی تایبەت بەو دەستدرێژییانەی دەکرێنە سەر جەستەی مرۆڤ، کە بازرگانیی پێوەکردنی ئەندامەکانی یەکێکە لەو دەستدرێژییانە. باشترین پێناسەی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بەم شێوەیەیە: «هەر تاکێک یان گرووپێکی

تاوانی ڕێکخراو هەڵبستن بە کۆکردنەوەی چەند مرۆڤێک بە بێ خواستی خۆیان، واتە بە فێڵ یان بە زۆر، یان تەنانەت بە خواستی خۆیان، بە مەبەستی دەرهێنان و لێکردنەوەی ئەندامەکانی جەستەیان و فرۆشتنیان وەک کالا بە مەبەستی بەدەستهێنانی قازانجی دارایی».

واتە بە شێوەیەکی گشتی مەبەست لە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بریتییە لە کڕین و فرۆشتن بە مەبەستی بەدەستهێنانی سوود و قازانج، بەڵام ئەم جۆرە بازرگانیکردنە مەشرووع و یاسایی نییە، چونکە ئەو کاڵایەی بازرگانیی پێوە دەکرێت وەک هەر کاڵا و شمەکێکی تر نییە، کە بە شێوەیەکی یاسایی بازرگانییان پێوە دەکرێت و دەفرۆشرێن و دەکڕدرێن، بەڵکوو ئەم جۆرە بازرگانییە تەواو نایاساییە، ئەگەر بێتو شوێنی بازرگانیی پێوەکردنەکە لە ڕووی یاساییەوە قەدەغە و یاساغ بێت، بۆ نموونە وەک بازرگانیکردن بە ماددە هۆشبەرەکان و ئەندامانی جەستەی مرۆڤ.

## سیما و تایبەتمەندییەکانی بازرگانیکردن به ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

بە شێوەیەکی گشتیی بازرگانیکردن به ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ کۆمەڵێک سیما و تایبەتمەندیی خۆی هەیە، کە دەتوانین لەم خاڵانەدا ئاماژەیان پێ بکەین:

1. تاوانێکی ڕێکخراوە:

توێژەران لە باسی بازرگانیکردن به ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ چەند زاراوە و دەستەواژەیەکی جیاواز بە کار دەهێنن، وەک تاوانی ڕێکخراو، تاوانی پرۆفیشناڵ، تاوانی لێهاتوانە، بەو پێیەی کە تاوانبارەکان لە چوارچێوەی ڕێکخراوێکدا کار دەکەن، کە چەند گروپێک لەو تاوانکارانە دەگرێتە خۆ، کە هەڵدەستن بە بەرهەمهێنان یان خستنەڕوو یان دابینکردنی ئەو کاڵا و خزمەتگوزارییانەی نایاسایی و قەدەغە کراون، ئەمە سەرەڕای بوونی چەند گروپێک لەو خەڵکانەی زۆر پێویستیان بە بەدەستهێنانی ئەم جۆرە کاڵا و خزمەتگوزارییانە هەیە، جگە لە چەندین گروپی تری فەرمانبەرانی گەندەڵ لە کەرتی گشتیدا،

که هەڵدەستن بە پارێزگاریکردن لەو تاوانبارانە، ئەوەیش لە پێناو بەدەستهێنانی بڕێک پارە و قازانج.

ئێمە لێرەدا باسی تاوانێکی ڕێکخراو ناکەین بە مانای هەڵسوکەوت یان ڕەفتارێک، کە فۆڕمی ڕێکخراوەیی بە سەریدا زاڵ بوە، بەڵکوو لە باسی ڕێکخراوێکداین، کە خاوەنی ئامانجی تاوانکارییە لە دژی شکۆی مرۆڤایەتی، چونکە بە تەنها یەک تاوان نییە، کە لە لایەن کەسێکەوە ئەنجام دەدرێت، یاخود چالاکییەکی تاوانکاریی ڕووت بێت، بەڵکوو پرۆژەیەکی تاوانکارییە، کە چەندین جۆر کار و چالاکیی تاوانکاریی لە خۆ دەگرێت، کە لە سەر دەستی کەسانێکی بەشداربووی زۆر بەڕێوە دەبرێت، کە چەتە و قۆڵبڕن تا دەگاتە ئاستی پزیشکەکان و بازرگانە گەورەکان. بەم شێوەیە ئەم ڕێکخراوە تاوانکارە ڕۆڵ و پێوەندیی جۆراوجۆر و دۆخی جیاواز پەیڕەو دەکات بە مەبەستی بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانی، کە خۆی لە بەدەستهێنانی قازانجی ماددی دەبینێتەوە، بە بێ گوێپێدان بە بەها مرۆڤایەتییەکان.

2. تاوانێکی تازە هەڵکەوتوە:

دیاردە تاوانکارییە تازە هەڵکەوتوەکان ئەوانەن، کە لە جۆر و فۆڕمە تازەکانی تاوان یان شێوازە تازەکانی ئەنجامدانی تاوانی ئەنجامدراو لەوەو پێش لە گۆڕەپانی کاری نایاسایی و قەدەغەکراودا بە دەر دەکەوێت، سەرەڕای ئاشنابوونیان بە چۆنێتیی خۆدزینەوە لە دادپەروەری لە ڕێگەی پەیڕەوکردنی ئەو ڕێکار و شێوازانە، لە کاتێکدا تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ بۆ خۆی تاوانێکی تازەیە بە هۆی تازەیی فۆڕم و شێوازی پێوەندییەکان و ئامرازە بەکارهێنراوەکان لە لایەن تاوانکارانی ئەم بازرگانیکردنە.

3. تاوانێکە لە سەر خراپ بەکارهێنانی تەکنیکە پراکتیکییەکان کار دەکات. ئاشکرایە کە زۆرێک لە تەکنیکە زانستی و تەکنۆلۆژییەکان لە بنەڕەتدا بۆ خزمەتی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دروست کراوە، بەڵام ئەوانەی بازرگانی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤەوە دەکەن هەندێک لەم تەکنیکە زانستییانە بە

خراپی بەکار دەهێنن، وەک چاندنی ئەندامەکانی جەستە و گواستنەوەیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.

4. تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە کار لە سەر لەناوبردن و خراپکردنی بەها کۆمەڵایەتییەکان و پێوەندییە خێزانییەکان دەکات، کە بۆی هەیە ببێتە هۆکاری دروستکردنی چەندین ناکۆکی و پشێوی و گرفت، بگرە شەڕ و ململانێ لە نێوان بنەماڵە و خێزانەکاندا.

5. ئەم تاوانە فۆڕمێکی نێودەوڵەتی هەیە و کەوتوەتە ژێر کاریگەریی گلۆبالیزم، واتا لە سایەی گلۆبالیزمدا تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ڕیتم و فۆڕمێکی نێودەوڵەتیی وەرگرتوە، زیاتر لەوەی فۆڕمێکی لۆکاڵی و هەرێمی هەبێت، ئەمەیش لەبەر ئەوەیە کە پێشکەوتنی زانستی و گواستنەوەی زانیارییەکان و پێشکەوتنی هۆیەکانی گواستنەوە ڕۆڵیان لە پێکهێنانی سیستمی گلۆبالیزمدا هەیە، ئەمەیش وای کردوە هەندێک لە هەژاران،

واتا بەشێک لە دانیشتوانی دەوڵەتانی تازە گەشەسەندوو بچنە ژێر ڕکێف و فەرمانی باند و مافیا فرەڕەگەزەکانی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ.

6. ئەم تاوانە مەترسیدارە لە سایەی نەبوون یان لەدەستدانی هەندێک لە بونیاد و دامەزراوە یاساییەکان و میکانیزمەکانی دیسپلینی کۆمەڵایەتیی فەرمیی تایبەت بە بەگژداچوونەوەی ئەم تاوانە لە سەر ئاستی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی.

7. تاوانێکی ژێراوژێرە و ڕەهەندەکانی شاراوەن، چونکە زۆرێک لەم تاوانانە ئاشکراکردنیان قورسە، بەم هۆیەیشەوە ئاشکرابوونی داتا و ئامارە فەرمییەکانی تاوانەکە کارێکی ئاسان نییە.

8. تاوانێکە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی تاوانکاریی زۆر لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت، واتا چەندین تاوانی لاوەکی تر دەگرێتە خۆ، وەک هەڵخەڵەتاندن، ڕفاندن، دزیکردن، هەڕەشەکردن بە ناوزڕاندن، ئیستیغلالکردن، تەڵەکەبازی،

ساختەکاری، بەقاچاغبردن و چەندین جۆری تریش.

9. تاوانێکی فرەلایەن و فرەبەشداره لە ڕووی ژمارەی تاوانباران و قوربانییەکانییەوە.

10. تاوانێکە لە ئەنجامی کۆمەڵێکی زۆر گۆڕانکاریی کۆمەڵاتییەوە سەری هەڵداوە و ناکرێت تەنها یەک هۆکار لە پشتییەوە بێت.

11. تـاوانـێکـە دەسـتـدرێـژیـی بـۆ سـەر ئازادی و ویستی کەسی تاوانلێکراو دەگرێتە خـۆ، ئـەوەیـش بـە هـۆی کاریگەریی ڕێگە و شێوازەکانی فێڵکردن، هەڵخەڵەتاندن و ڕفاندن، کە تاوانبارەکان پەنایان بۆ دەبەن.

## هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

لە ڕاستیدا ئەم جۆرە بازرگانییە نایاسایی و قەدەغەکراوە، کۆمەڵێک فاکتەر و هۆکاری پاڵنەری هەیە لە سەر ئاستی لۆکاڵی و نێودەوڵەتی، گرینگترینیان ئەمانەن:

أ. ئەو کەسانەی بازرگانی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤەوە ئەنجام دەدەن لە بەرانبەردا پێویستییان بە دەستکەوتنی دارایی یان نرخی ئەو ئەندامەی جەستە هەیە، کە کەسێک

دەیبەخشێت بە هۆی دژواریی باری بژێویی و ئابوورییەوە، بە تایبەتی لە هەندێک کۆمەڵگەی هەژار و بێدەرەتان، کە خراپیی ژیانگوزەراندن تێیاندا وای کردوە هەندێک خەڵک بە ناچاری هەڵبستن بە فرۆشتنی ئەندامانی جەستەیان لەبەر پێویستییان بە پارە و خەرجی.

ب. فراوانبوونی ڕووبەری چالاکییەکانی تاوانی ڕێکخراو، کە ڕێگەخۆشکەرە بۆ گەشەسەندنی ئەم جۆرە بازرگانیکردنە، لە کاتێکدا باندەکانی تاوانی ڕێکخراو لەم بوارە تازەیەدا کەڵکیان وەرگرتوە بۆ بەدەستهێنانی قازانجی زۆر گەورە. لە ڕاپۆرتی پەرلەمانی سویسرا، کە ئاراستەی کۆمەڵەی پەرلەمانیی ئەنجوومەنی ئەورووپا کراوە، ئاماژەی پێ دەکات، کە کاتێک کڕیاران و داواکارانی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بڕی 100000 تا 200000 دۆلاری ئەمەریکی دەدەن بە نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامەکان بۆیان، بەڵام ئەوانەی ئەندامانی جەستە، بۆ نموونە وەک گورچیلە دەفرۆشن تەنها 3000 دۆلار وەردەگرن.

ت. ئاشکرایە کە پرۆسەی گواستنەوە

لە نێوان ئەو کەسانەیش، کە هیچ نزیکی و خزمایەتییان پێکەوە نییە، بە شێوەیەکی تەواو نهێنی ئەنجام دەدرێت، هەر وەک داتا و ژمارەی ڕاستەقینە و هیچ بەدواداچوونێک نییە، کە پشتی پێ ببەسترێت بۆ ئەوەی یاساکان لە دژی سەرپێچیکاران جێبەجێ بکرێت. لە پێناو تێپەڕاندنی هەموو کێشە ئەمنییەکان، باند و دەڵاڵەکان پەنا دەبەنە بەر ناچارکردنی بەخشەرەکان تا ڕوو بکەنە وڵاتانی وەک ڕووسیا، ئۆکرانیا و تورکیا بە مەبەستی ئەنجامدانی نەشتەرگەری، چونکە بەم شێوەیە دەردەکەوێت، کە کەسی بەخشەری ئەندامێکی جەستە بە گوێرەی یاسا و بە خواستی خۆی چوە بۆ ئەو شوێنە تا ئەو کارە بکات، بەمەیش تاوانباران لە لێپێچینەوە و سزای یاسایی دەربازیان دەبێت.

ث. پێشکەوتنی زانستی و تەکنیکی لە بواری پزیشکی و ئەو سەرکەوتن و دەستکەوتە زانستییانەی لە بواری گواستنەوەی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە دی هاتوە، هۆکارێکی سەرەکییە بۆ تەشەنەکردنی ئەم بازرگانییە لە جیهاندا.

ج. زۆربوونی جۆر و تایپی نەخۆشییەکان و بڵاوبوونەوەیان.

ح. زیادبوونی ژمارەی ئەو نەخۆشانەی پێویستیان بە بەدەستهێنانی ئەندامەکانی جەستەی کەسانی تر هەیە لە سەر ئاستی جیهان.

خ. زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، کە تەقینەوەیەکی دیمۆگرافی لە جیهاندا دروست کردوە.

د. خۆپابەندنەکردنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە لە کات و شوێنی دیاریکراو.

ذ. نەبوونی سیستم و یاسای تایبەت بۆ ڕێکخستنی پرۆسەی چاندنی ئەندامانی جەستە لە هەندێک وڵات، یان بە تاوان ئەژمارکردنی لە هەندێک وڵاتی تری جیهان، جگە لە نەبوونی ڕێکاری کۆمەڵایەتی و فەرمی تایبەت بە بەگژداچوونەوە و نەهێشتنی ئەم جۆرە بازرگانیکردنە.

ر. نەبوونی چاودێریکردنی توند لە سەر ئەوانەی لە بواری پزیشکی کار دەکەن، کە

بوەتە هۆی دروستبوونی فێڵ و تەڵەکەبازی لە بواری بەدەستهێنان یان گواستنەوەی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ.

ز. زۆربوونی ژمارەی منداڵانی سەرشەقام، یان ئەوانەی بە منداڵانی ناشەرعی ناو دەبرێن، کە وای کردوە ڕووبەڕووی ڕفاندن و دزینی ئەندامانی جەستەیان ببنەوە.

س. نەبوونی ئەڵتەرناتیڤی پیشەسازی لە بریی هەندێک ئەندامی جەستەی مرۆڤ، ئەمەیش وای کردوە بەردەوامبوونی ژیانی هەندێک کەس زۆر قورس بێت.

ش. لاوازیی پێگەی ئاکاری کۆمەڵایەتی و دینی و ئەخلاقی لە لای هەندێک لە چین و توێژەکانی کۆمەڵگە.

ص. هەبوونی هەندێک دۆزینەوەی زانستی، کە پرۆسەی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ئاسانتر دەکات، بۆ نموونە وەک سەهۆڵی وشک، کە لە توانایدایە بۆ ماوەیەک ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بپارێزێت.

له ڕاستیدا ئەم هۆکارانەی باس کران سەرچاوەی مەترسین له بابەتی بازرگانیکردن به ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، چونکه هەندێک شار بوونەته بازاڕێک بۆ نمایيشکردن و فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، ئەمەيش له ڕاپۆرتی کۆمەڵەی «ئاکاری پزيشکی»دا پشتڕاست کراوەتەوە، که ئاشکرای کردوه زۆرينەی هەرەزۆری کارەکانی گواستنەوەی گورچيله له سەرەتای ئەنجامدانی له ميسر تا ئەمڕۆيش له ڕێگەی کڕينوفرۆشتنەوه دەکرێت، بەم هۆيەوه بازرگانييەکه گەشەی کرد تا شاری قاهيره گۆڕا بۆ بازاڕێکی نێودەوڵەتی بۆ فرۆشتنی گورچيلەی ميسرييه هەژارەکان به دەوڵەمەندانی عەرەب يان ميسری، ئەمەيش ڕاستييەکی ئاشکرا و حاشاهەڵنەگره و له هەموو ئەو توێژينەوانەی باسی ئەم بابەته دەکەن ئاماژەی بۆ کراوه، سەرەڕای بەرزبوونەوەی ژمارەی ئاگاداری و هۆشدارييەکانی تايبەت به کەسانی ونبوو و بێسەروشوێن لەو وڵاتەدا.

## گونجاندنی یاسایی تاوانی بازرگانیکردن به ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

ئەمڕۆ بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە بوەتە یەکێک لە بازرگانییە پڕ داهاتەکان، کە سوود و قازانجێکی زۆر وەدەست ئەنجامدەرانی دەخات. ئەو یاسایانەی لە هەندێک وڵاتدا دەرچوون بۆ ڕێکخستنی پرۆسەی گواستنەوەی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ پێداگری لە سەر ئەوە دەکەن، کە دەبێت ئەم کارە وەک بەخشینی ئەندامی جەستە بکرێت نەوەک فرۆشتنی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر. لێرەوە پرسیارەکە دروست دەبێت: ئایا ئەم پرۆسەیە پێی دەگوترێت بەخشین یان فرۆشتن؟

ماددەی (511- برگەی2)ی یاسای سزادانی فەرەنسی ژمارە (653) کە لە ساڵی 1994 تایبەت بە ڕێزگرتن لە جەستەی مرۆڤ دەرچوە، هەروەها ماددەی (674- برگەی2) لە یاسای تەندروستیی گشتیی هەموارکراو بە یاسای ژمارە (654)ی ساڵی 1994 سزای بەندکردنی بۆ ماوەی 7 ساڵ و غەرامەکردنی بە بڕی 700000 فرەنکی داناوە بۆ هەر

کەسێک هەوڵ بدات بۆ بەدەستهێنانی ئەندامێکی جەستەی مرۆڤ لە بەرانبەر دەستکەوتنی ماددی، هەروەها ماددەی (511 – بڕگەی 27) ی هەمان یاسا ئاماژەی کردوە بۆ بێبەشکردنی ئەو پزیشکەی کاری بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەوە دەکات لە بەردەوامبوونی لە سەر پیشەکەی و دوورخستنەوەی بۆ ماوەیەک، کە لە 10 ساڵ کەمتر نەبێت.

بەڵام ڕێگەی تێدەچێت پزیشکێک نەشتەرگەریی دەرهێنان یان گواستنەوەی ئەندامێکی جەستەی نەخۆشێک ئەنجام بدات بەو بیانوەی، کە پێویستە لە ناو ببرێت چونکە مەترسی لە سەر ژیانی دروست دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە دوورە لە ڕاستییەوە، وەک ئەوەی هەندێک جار بە نەخۆشەکان دەگوترێت، کە پێویستە یەکێک لە گورچیلەکانی دەربهێنرێت، لەبەر ئەوەی مەترسی لە سەر تەندروستیی دروست کردوە، بەڵام لە ڕاستیدا گورچیلەکانی بێ کێشە و سەلامەتە. دیارە مەبەست لەم کارە فرۆشتنی ئەو گورچیلەیە بە کەسێکی تر، لێرەیشدا کێشەیەکی نوێ سەر هەڵدەدات: ئایا

جۆری ئەو تاوانە چییە، کە پزیشک لەم جۆرە حاڵەتانەدا دەیکات؟

من پێم وایە نابێت تەنها بە هۆی ئەنجامدانی تاوانی دزیکردن لێپێچینەوە لەگەڵدا بکرێت، چونکە دزیکردن لە ماڵێکی گواستراوە دەکرێت، بەڵام ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ماڵ و دارایی گواستراوە نییە، لەبەر ئەوە ئەمەیان تاوانێکی جیاوازە لە دزی. لە کاتی قووڵبوونەوە لە وردەکارییەکانی ئەم تاوانە وای دەبینم، کە پزیشکەکە سەرەتا بوەتە هۆکاری دروستبوونی کەمئەندامبوونێکی هەمیشەیی لە جەستەی نەخۆشەکە، هەروەها بە دوایدا بونیادی دەستکەوتی دارایی نامەشرووع دێت، کە داڕێژەرانی یاسا لێرەدا وایان داناوە، کە ئەم کارەی پزیشکەکان دەیکەن بۆ خۆی تاوانێکی سەربەخۆیە، بۆیە سزاکەیشی لە سزای تاوانی ئاسایی زیاترە، چونکە کێشەیەکی هەمیشەیی بۆ مرۆڤە نەخۆشەکانی بەردەستیان دروست دەکەن، ئەوەیش بە هۆی بەستنەوەی بە بەدەستهێنانی پارە بە شێوەیەکی نایاسایی، لە کاتێکدا ئەگەر کارەکە نەکەن بێگومان دەستکەوتی ماددییان نابێت.

بۆ نموونە لە ماددەی ژمارە (319)ی یاسای سزادانی فەلەستینی هاتوە: «هەر کەسێک هەستێت بە ئەنجامدانی نەشتەرگەری بۆ دەرهێنان یان چاندنی ئەندامێکی فرۆشراوی جەستەی مرۆڤ، لە کاتێکدا بزانێت ئەوە کارێکی نایاساییە، بۆ ماوەی سزا دەدرێت کە لە 7 ساڵ زیاتر نییە». هەروەها ماددەی (320) هەمان یاسا دەڵێت: «دەڵاڵ و نێوەندگیران لەو تاوانانەی لەم بەشەدا ئاماژەیان بۆ کراوە بە هەمان سزای سەپێنراو بە سەر ئەنجامدەری ڕاستەقینەدا، سزا دەدرێن». ئەمە لە ئەنجامدا پاڵمان دەنێت تا یاسا دارێژەرانی وڵاتانی تری عەرەبی چاو لە یاسا دارێژەرانی فەلەستین بکەن، لە ڕووی ڕێگە و شێوازەکانی چارەسەرکردنە تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە و خانەکانی تری جەستەی مرۆڤ، ئەمەیش بە ئامانجی دانانی سنورێک بۆ ئەو تراژیدیا و مەینەتییانەی لە ئەنجامی ئەو کارانە لە ناو ژیانی پراکتیکیدا دروست دەبێت.

## کێڵگەکانی تاقیکردنەوەی زانستی و دەرئەنجامە نەرێنییەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ یەکێکە لە دیاردەکانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ لە جیهاندا بە شێوەیەکی گشتی، لەبەر ئەوە گرینگە لەم توێژینەوەیەدا هەڵوەستەی جددی لە سەر بکرێت و ناوەرۆکی ئەم تاوانکارییە شی بکرێتەوە. ئەم دیاردەیە لە ناو دەوڵەتە هەژارەکاندا زۆر بڵاو بوەتەوە،

کاتێک مرۆڤەکان هەڵدەستن بە نمایشکردن و فرۆشتنی ئەندامەکانی جەستەیان بۆ ئەوەی بڕێک پارەوپول بە دەست بخەن و لە بژێویی ڕۆژانەیاندا یارمەتییان بدات، لە کاتێکدا بارودۆخی ئابوورییان زۆر خراپە. ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤەکان دەگوازرێتەوە بۆ دەوڵەتانی هاوردەکار، کە بە گشتی دەوڵەتانی پێشکەوتوون لە ڕووی زانستییەوە. باند و مافیاکانی ئەم جۆرە بازرگانیکردنە زیاتر لەو وڵاتانەدا زۆرن، کە شەڕ و ململانێی سەربازی و چەکدارییان تێدایە لە پاڵ دەستێوەردانی هەرێمیی و نێودەوڵەتی. ئەو باندانە هەڵدەستن بە گواستنەوەی ئەندامانی جەستەی تووشبوون یان مردووەکان لە ئەنجامی شەڕ و پێکدادانی سەربازی بۆ دەوڵەتانی هاوردەکاری ئەو ئەندامانەی جەستە، بەمەیش قازانجێکی زۆر بە شێوەی نایاسایی بە دەست دەهێنن، بۆ نموونە ئەوەی لە عێراق ڕوو دەدات جۆرێکە لەم بازرگانییە و کاتێک باندەکان هەڵدەستن بە گواستنەوەی ئەندامانی جەستەی مرۆڤە نەخۆشەکان یان مردووەکان بە هۆی ململانێ و

پێکدادانە سەربازییەکان بۆ دەوڵەتانی ئەورووپا و ئەمەریکا، لەو ڕێگەیەیشەوە قازانجێکی قەبە بە شێوەیەکی نایاسایی بە دەست دەهێنن.

تاوانێکی تریش ئەوەیە، کە مرۆڤ لە توێژینەوە زانستییەکاندا لە جیاتی ئاژەڵ بە کار دەهێنرێت، بە تایبەت بۆ تاقیکردنەوە لە سەر داودەرمانی تازە بە مەبەستی بەدەستهێنانی پارە و دارایی. لە ڕاستیدا ئەم دیاردەیە لە دەوڵەتە هەژارەکاندا زیاتر هەیە، کاتێک کۆمپانیا جیهانییەکانی دروستکردنی دەرمان کەڵک لە نەداری و هەژاریی دەوڵەتە هەژارە تازەپێگەیشتوەکان وەردەگرن بۆ چارەسەرکردنی هاوڵاتییانیان، هەروەها کۆمپانیا جیهانییە گەورەکان هەڵدەستن بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانیان لە بواری داودەرمانی تازە بەرهەمهاتوو لە سەر مرۆڤ.

دەستتێکەڵاوکردنی نەخۆشخانە گشتییەکان و دامودەزگا زانستییەکان لەگەڵ ئەو کۆمپانیا گەورانەی، کە بازرگانی بە تەندروستیی مرۆڤەوە دەکەن، بوەتە هۆی بڵاوبوونەوەی ئەم بازرگانییە نایاساییە لە جیهاندا. ئەو

نموونە ویـژدان هەژێنەی، کە میدیاکانی بەریتانیا ئاشکرایان کرد، باشترین ئاماژەیە بۆ ئەنجامدانی ئەم تاوانانە، کاتێک کارمەندانی توێکاری لە سەر تەرمەکان لە نەخۆشخانەی منداڵان لە شاری پرینگهام هەستاون بە دەرهێنان ڕژێنە گرێکان لەو تەرمانە و فرۆشتنی بە کۆمپانیایەکی دروستکردنی دەرمان، کە تایبەتمەندە لە بەرهەمهێنانی هۆرمۆنەکانی گەشەکردن. ئەم کارە نەوەستێنرا تا ئەو کاتەی ئەم هۆرمۆنە چارەسەرییانەی ئەو کۆمپانیایە بەرهەمی دەهێنا بوە هۆی مردنی 25 نەخۆش، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کارمەندانی دامەزراوە توێکارییەکە بەردەوام بوون لە سەر فرۆشتنی ئەو ڕێژەیەی کە لە ساڵی 1959وە تا ساڵی 1985 لە تەرمی مردووەمان دەریان دەهێنا. یەکێک لە کۆمپانیاکانی دروستکردنی دەرمان لە بەریتانیا هەستا بە وەرگرتنی چەند خانەیەکی بۆنبڕ لە جەستەی نەخۆشێک لە نەخۆشخانەیەکی گشتی لە بەریتانیا و دایە ناوەندی توێژینەوەکانی کۆمپانیاکانی دەرمان بە مەبەستی بەکارهێنانی لەو توێژینەوانەی، کە

ئەو کۆمپانیایە بە بێ هیچ بنەمایەکی یاسایی ئەنجامی دەدات.

بەکارهێنانی تەرم یان جەستەی مرۆڤ بە مەبەستی ئەنجامدانی تاقیکردنەوە زانستییەکان بە بێڕێزی و پێشێلکردنی مرۆڤایەتی و شکۆی مرۆڤ دەدرێتە قەڵەم. لە دەوڵەتە پێشکەوتوەکاندا، کە یاسا تێیاندا سەروەرە، توێژینەوە زانستی و پزیشکییەکان کەسانی خۆبەخش بە کار دەهێنن، کە بە ویست و خواستی خۆیان بە هۆکاری مرۆڤایەتی دێن و ئەو تاقیکردنەوانە لە سەر جەستەیان یان لە سەر چەند ئەندامێکی گرینگی جەستەیان دەکەن. لە ڕاستیدا ساختەکاری و سووکایەتیکردن بە جەستەی مرۆڤ بە بێ لەبەرچاوگرتنی هۆکارەکانی خۆپاراستن و لە ئەستۆ نەگرتنی هیچ بەرپرسیارێتییەکی (ئەخلاقی، زانستی، ئایینی)، چەند هەڵسوکەوتێکە پێچەوانەی هەموو ئایین و پەیامە ئاسمانییەکانە.

لە ڕاستیدا ناچارکردنی مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی داودەرمان لە سەری، کارێکی نامرۆڤانەیە و بۆی هەیە مرۆڤ

تووشی مەترسیی ڕاستەقینە بکات. لە ئێستادا کۆمپانیاکانی دروستکردنی دەرمان هەوڵ دەدەن بۆ کەمکردنەوەی تێچووی ماددیی دەرمان، بۆیە پێشبینی دەکرێت ئەم شێوازە تازەیە تێچووەکان بە ڕێژەی 100 ملیۆن دۆلار بۆ هەر جۆرێکی دەرمان کەم بکاتەوە، کە لە جێی ئاژەڵ لە سەر مرۆڤ تاقی دەکرێتەوە، بەڵام ئەمە قازانجی بۆ نەخۆشەکان دەبێت، لەبەر ئەوەی تێچووی دەرمانەکانیش بە شێوەیەکی بەرچاو کەم دەبێتەوە. ئێستا ڕوونە، کە مرۆڤ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ خراوەتە ڕیزی ئاژەڵ بۆ تاقیکردنەوەی داودەرمان، ئەمە سەرەڕای نارەزاییی خەڵک لە سەر بەکارهێنانی ئەم هەڵسوکەوتە نامرۆڤانەیە، بەڵام لە ڕووی ئابوورییەوە سوود و قازانجێکی زۆر دەستەبەر دەکات.

1. هەڵوێستی لایەنگرانی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و بەکارهێنانیان بۆ کاری زانستی

لایەنگرانی ئەم ئاراستەیە پێیان وایە ئەگەر فرۆشتنی جەستەی مرۆڤ بە گشتی کارێکی

نەشیاوە و نابێت بکرێت، لە سەر ئەو بنەمایەی کە جەستەی مرۆڤ ناچێتە خانەی موڵک، چونکە پارە و دارایی نییە تا خاوەندارێتی بکرێت، بەڵام نەشیاویی فرۆشتنی ئەندامەکانی یان بەشێک لە جەستەی مرۆڤ وا دەکات هیچ کەڵکی لێ وەرنەگیرێت. لایەنگرانی ئەم بۆچوونە دەڵێن «ئەگەر گونجاو بێت کەڵک لە جەستەی مرۆڤ وەربگیرێت، ئەوا سوودی دەبێت و فرۆشتنی شیاوە»، بەڵام نرخی ئەندامێک یان ئەو بەشەی کە مامەڵەی لە سەر دەکرێت لە سەر گرێبەستی فرۆشتنی هیچ بوونێکی نییە، پاشان ئەم مامەڵە یاساییە بۆ فرۆشتنی ئەندامێکی جەستە یان بەشێکی وەک چاو یان گورچیلە، کە ئەندامی دوانەن لە جەستەی مرۆڤ، پێچەوانەی کەرامەتی مرۆڤایەتی نییە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە واتای مرۆڤایەتی لە خۆ دەگرێت، ئەگەر ئامانجەکە ڕزگارکردنی ژیانی نەخۆشێک بێت لە ئازار و مەینەتی.

سەرەڕای ئەوەی کە فرۆشتنی بەشێک لە ناو جەستەی ئادەمیزاد وەک خوێن، کە یەکێکە لە پێکهاتە نوێبوەکان لە جەستەی مرۆڤ

پێچەوانە نییە لەگەڵ ئازادیی مرۆڤدا، بۆیە هەر کەسێک هەڵسێت بە فرۆشتنی ئەندامێکی دوانەی جەستەی وەک خوێن و یان گورچیلە، یان خانەیەکی وەک پێست، تووشی نارەحەتی و ناخۆشی ناکات، بەڵکوو هیچ لە ئازادییەکەی لە دەست نادات، بە تایبەتییش بەڵگەکانی حوکمە شەرعییەکان ڕێگەیان داوە بە فرۆشتنی شیری دایک بە پێی گرێبەستی شیرپێدان. شیری دایک لە لای ئەم گروپە لایەنگرەی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ (ئەوانەی لە ئادەمیزادا قابیلی ئەوەی مامەڵەیان پێوە بکرێت)، دەیشڵێن فرۆشتنی شیر لە مەزهەبی شافیعی و مالیکی-دا جائیزە، چونکە لێرەدا پێوەرەکە جائیزە کاتێک خوێن و خانەکانی تر لە سەر بنەمای شیری دایک دەپێون.

هەروەها لایەنگرانی ئەم ئاراستەیە پێیان وایە پێویست دەکات کاری فرۆشتنی ئەندامانی جەستە بە شێوەیەکی ڕێکخراو بێت، بۆ ئەوەی فرۆشتنی هەر ئەندامێکی جەستەی مرۆڤ نەبێتە هۆی دروستبوونی کێشەیەکی هەمیشەیی لە جەستەدا، وەک تێکچوونی بەشەکی یان گشتی جەستە،

بەڵکوو پێویستیشە فرۆشتنی ئەندامانی جەستە بۆ ناوبانگ دەرکردن نەبێت. کەواتە لایەنگرانی ئەم بۆچوونە دەیانەوێت پاڵنەرەکانی بەخشینی ئەندامانی جەستە یان چەند بەشێکی جەستەی مـرۆڤ، کە ئامانجێکی مرۆڤانەی لە پشتە بۆ ڕزگارکردنی ژیانی کەسانێکی تر، پاڵنەریش بێت بۆ گرێبەستکردن وەک پرۆژەیەک لە چوارچێوەی پابەندێتیی مەدەنی، لە کاتێکدا ئەگەر بەخشینی ئەندامێکی جەستەی مرۆڤێک بە مرۆڤێکی تر بۆ ناوبانگ و خۆدەرخستن بێت بێگومان ئەم ئامانجەی لە پشت نابێت. هەندێک لە لایەنگرانی ئـەم ئاراستەیە دەڵێن فرۆشتنی ئەندامەکانی جەستە و هەندێک لە بەشەکانی تـری جەستە کارێکی شیاوە، بۆیە پێشنیار و بۆچوونەکانیان پێشکەش دەکەن بە مەبەستی کارئاسانیکردن بۆ کارە یاساییەکانی تایبەت بە لایەنی پزیشکی، بۆیە داوا لە حکوومەت دەکەن یاسایەک دەربکات، کە تێیدا ئاماژە بە نرخی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ و مەرجەکانی فرۆشتنیان بکرێت "لە هەر دوو حاڵەتی فرۆشتن بە تاک و بە کۆ"، چونکە لەو بڕوایەدان فرۆشتنی ئەندامەکانی جەستە بە

پێی خشتەی نرخی دانراوی سەپێنراو لە لایەن دەوڵەتەوە هیچ لە سروشتی مرۆڤ ناگۆڕێت و زیان بە شکۆ و کەرامەتی ئادەمیزاد ناگەیەنێت، چونکە خودی گرێبەست بۆ خۆی پرۆژەیەکە و هیچ مانایەک بۆ جیاکردنەوە لە نێوان فرۆشتن و بەخشین نییە.

هەندێکی تر پێیان وایە، لە بنەڕەتدا هیچ کێشەیەک نییە لە قبوڵکردنی بیرۆکەی فرۆشتنی ئەندامانی جەستە و پارچەکانی تری لەشی مرۆڤ، چونکە ئەوە ڕێگەیەکی باشە بۆ ئەوەی دەروونی مرۆڤێک ئاسوودە بێت، کە بە هۆی بەخشینی ئەندامێکی جەستەی بە کەسێکی تری بێدەرەتان، وێنایەکی مرۆڤایەتیی بەهێزە بۆ بەردەوامبوونی ژیان و بەرژەوەندیی کەسی بەخشەر و منداڵەکانی، لە بەرانبەریشدا کەسێکی تر درێژە بە ژیانی ئاسایی خۆی دەدات، بەڵام سەبارەت بە تەرم، یان جەستەی مردوو، هەندێک دەڵێن: دەکرێت ئەندامەکانی بفرۆشرێت، وەک ئەوەی شیاوە ئەندامێک یان پارچەیەک لە جەستەی مرۆڤێکی زیندوو بفرۆشرێت، چونکە ئەوەی موڵکداریێتیی تەرمەکە یان جەستەکە

دەکات، دەتوانێت بە وەرگرتنی بەرانبەرەکەی مامەڵەی پێوە بکات، ئامانجە سەرەکییەکەیش بریتییە لە خزمەتکردنی خەڵک زانست و خەڵکی کۆمەڵگە، ئەوەیشی لە بەرانبەردا وەردەگیرێت تەنها مەسەلەیەکی لاوەکییە، بەڵام خاوەنی ئەم بۆچوونە دان بەوەدا دەنێت، کە ژمارەیەکی کەمی خەڵکی پشتگیریی ئەم بیروڕایەی دەکەن.

سەرەڕای شیاویی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی ئادەمیزاد بە بۆچوونی لایەنگرانی ئەم ئاراستەیە، بەڵام دەرکەوتوە، کە دوودڵن لە ڕاگەیاندنی ئازادی لە فرۆشتن و بابەتەکەیان وابەستە کردوە بە کۆمەڵێک مەرج و کۆتوبەندەوە، کە گرینگترینیان ئەمانەن:

- فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە کاتی پێویستدا شیاوە، مادام پێویستی بە فرۆشتنی پاساوێکی زاڵە، بەڵام ئەوەیش بەندە بە کۆمەڵێک مەرجەوە.

- نابێت فرۆشتنی ئەندامانی جەستە پێچەوانەی شکۆ و کەرامەتی ئادەمیزاد بێت، بە جۆرێک کە ئامانج لێی بازرگانی و بەدەستهێنانی سوود و قازانج نەبێت.

- پێویستە فرۆشتنی ئەندامی جەستە لە پێناو کەڵکوەرگرتن بێت لێی، چونکە بۆ بەردەوامبوونی ژیان خوڵقاوە، بەڵکوو نابێت بە کەسانێک بفرۆشرێت کە خۆیان بە کاری ناهێنن.

- نابێت فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ پێچەوانەی دەقێکی شەرعی تایبەت، یان بنەمایەکی شەرعی بێت، جگە لەوەی باس کراوە، بۆ نموونە وەک "تۆوی پیاو".

- لە کاتێکدا ئەم ئەندامانی دەفرۆشرێت، کە هیچ جێگرەوەیەکی پیشەسازیی دروستکراو بۆ ئەندامانی جەستەی ئادەمیزاد نەبێت، کە هەمان ڕۆڵ ببینێت.

- دەبێت کڕینوفرۆشتن لە ژێر چاودێریی دامەزراوەیەکی تایبەتمەندیی فەرمیی متمانەدار و باوەڕپێکراودا ئەنجام بدرێت.

2. هەڵوێستی نەیارانی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

لایەنگرانی ئەم ئاراستەیە پێیان وایە گرێبەستی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی ئادەمیزاد لە ڕووی شەرعی و یاساییەوە

پووچەڵ و بێ بنەمایە، بەڵکوو پێشیان وایە گرێبەستی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ یان هەر بەشێکی یان فرۆشتنی تەرم کارێکی پووچەڵە، تەنانەت ئەگەر لە چوارچێوەی بنەما و ڕێنماییە یاساییەکانیشدا بێت، کە لە لایەن لایەنگرانی ئاراستەی یەکەمەوە داڕێـژراوە، چونکە لە دیدی لایەنگرانی ئاراستەی دووەم فرۆشتنی ئەندامانی جەستە و تەرمی مرۆڤ کارێکی تەواو نەشیاوە، چونکە لە جێی مافەکان پارە دانراوە، نەک گۆڕینەوەی شتێک بە شتێک، ئەوەیش نابێتە ناوەڕۆکی گرێبەست، لە کاتێکدا جەستەی مرۆڤ و ئەندامەکانی جەستە سامان و دارایی نییە تا بگونجێت بۆ مامەڵەپێوەکردن، لەبەر ئەوەی خوداوەند ڕێزی لە مرۆڤ ناوە و نابێت وەک سامان و پارە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، پاشان لەشی ئادەمیزاد لە جێی پارە و دارایـی نییە، لەبەر ئـەوە فرۆشتنی گۆشت ئادەمـیـزاد حـەرامـە بـە شیری ئافرەتیشەوە، چونکە شیر هیی گۆشتیەکەیەتی، بەڵام ئەگەر کەڵکوەرگرتن لێی دروست بێت بۆ ئازاردانی مـنـداڵ، ئـەمـە هـەڵاوێردکـردنێکـە پـێـوانـەی لە

سەر ناکرێت. بەشێکی فیقهی لە عێراق پێی وایە «کڕینی ئەندامی جەستەی مرۆڤێک بە هەڵبژاردنی کارێکی نەشیاوە، ئەمەیش لەبەر ئەوەی زۆرێک لە شەرعزانانی وەک ئەبی حەنیفە و مالیک و ئەحمەد، لەگەڵ هەندێک لە شوێنکەوتوانی شافیعی، پێیان وایە فرۆشتنی شیری ئافرەت و قژی مرۆڤ کارێکی نەشیاو و نەگونجاوە. لایەنگرانی ئەم ئاراستەیە ئەم پرسیارەیان لە ئەبی حەنیفە کردوە: ئایا دەکرێت بڵێین فرۆشتنی ئەندامی جەستە لە کاتی ناچاریدا جائیزە؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتوویەتی: «من پێم وایە کەسێک ڕێگەی پێ دەدرێت بیکڕێت لەگەڵ ئەوەی ئێمە دەڵێین فرۆشتنی کارێکی جائیز نییە، هاوتای ئەمەیش بابەتی فرۆشتنی قورئانە لە لای هەندێک لە شەرعزانان».

حەنبەلییەکان واجبیان کردوە، کە ئەوەی دەفرۆشرێت ماڵ و سامان بێت، کە کەڵک و سوودی هەیە و ڕێپێدراوە بۆ دابینکردنی پێویستییەک، بۆیە فرۆشتنی ئاژەڵ یان خانوو دروستە، هەرچەندە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فرۆشتنی هەندێک ئاژەڵ و فرۆشتنی

قورئانی بە لاوە باش نەبوە، بەڵکوو ئەوانەی پێویستیان بە خوێندنەوەی هەبوە پابەندی کردوون بە وەرگرتنی. لە لایەکی ترەوە فرۆشتنی خوێن و بەراز و جرِوجانەوەرات دروست نییە. لەمەیش زیاتر حەنەفییەکان فرۆشتنی پێستی ئاژەڵی مردوویان لە پێش کەوڵکردنی و فرۆشتنی پێست و ئێسقان و تووک و دەمارەکانی بەراز و قژ و ئێسقانەکانی مرۆڤیان حەرام کردوە، بەڵکوو هەندێک لە حەنبەلییەکان برِینی هەر پارچەیەکیان لە جەستەی مردوو یان لەنابردنی یان سووتاندنی حەرام کردوە، بەلاّم پێیان وایە برِینی چەند بەشێک لە لەشی مرۆڤی زیندوو وەک سزادان یان دانانی سنور پێویست بە زەمان ناکات.

ئاراستەی گشتی لە یاسای فەرِەنسا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە هەر رِێکەوتنێک پێچەوانەی مافی مرۆڤ بێت لە کەڵکوەرگرتن لە جەستەیەکی تەواو کارێکی پووچەڵ و بێ بنەمایە، لەبەر ئەوەی کە پێچەوانەیە لەگەڵ بنەما و رِیساکانی سیستمی گشتیدا، بەم پێیەیش هەموو پێکهاتن و رِێکەوتنێک کە دژ

به سەلامەتیی ژیانی مرۆڤ بێت پووچەڵە، لە نێوانیشیاندا فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی ئادەمیزاد یان بوردنی لە بەرپرسیاریێتی یان کەمکردنەوەی ئاستی ئەو بەرپرسیاریێتییە، ئەگەر ئامانجی ڕێکەوتنەکە بوردن بێت لە هەڵەی ئەنقەست یان هەڵەیەکی مەترسیدار. پرۆفیسۆر دیمۆگ پێی وایە: "هەموو ڕێکەوتنێک پێچەوانەی ژیان و سەلامەتیی جەستەی مرۆڤ بێت پووچەڵ و بێبنەمایە"، هەر یەکە لە یاسادانەران (پلانیۆل، ڕیبیر، ئیسان) ئەم بنەمایەیان بە لاوە پەسەندە.

کۆمسیۆنی نەتەوە یەکگرتوەکان تایبەت بە ڕێگرتن لە تاوان و دادپەروەریی جینائی، لە دانیشتنی ژمارە (23)دا لە مانگی ئایاری ساڵی 2014 پرۆژە بڕیارێکی پەسەند کرد، کە لە لایەن بیلاڕووسیا پێشنیار کرا بە ناونیشانی "نەهێشتنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و بازرگانیکردن بە مرۆڤ بە مەبەستی دەرهێنانی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و بەگژداچوونەوەی". ئەم بڕیارە نووسینگەی

پەیوەستی نەتەوە یەککگرتوەکانی تایبەت بە مادده هۆشبەرەکان و تاوان پابەند کرد بە ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی فراوان دەربارەی ئەم پرسە و ئامادەکردنی ڕاپۆرتێک، کە پاشان لە ساڵی 2016دا پێشکەشی کۆمسیۆنەکە کرا لە هەوڵێکدا بۆ باشترکردنی بابەتی تێگەییشتن لە ڕەهەندەکانی ئەم تاوانە، ئەوەیش یارمەتیدەر دەبێت بۆ دەڕشتنی سیاسەتی کارا و بە ئەنجام بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم تاوانە لە سەر ئاستی جیهان.

لە ڕاستیدا هیچ چەمکێکی یەککگرتوو نییە بۆ تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، تەنانەت میکانیزمێکی جیهانی پابەند و پەیوەستکراویش نییە لە ڕووی یاساییەوە تا ڕێگەی لێ بگیرێت. نەبوونی ئەم دوو فاکتەرە مانای ئەوە نییە ئەم جۆرە تاوانە گرینگیی پێ نادرێت، بەڵام ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی ئەم تاوانە تازەیە لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا هەنگاوە سەرەتاییەکانی خۆی هەڵدەنێت، بۆیە پێویستە هەوڵدانی جددی هەبێت بۆ تێگەییشتن لە

چوارچێوە و قەبارەکەی لە پێناو سنورردارکردنی و نەهێشتنی.

بە گشتی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ سێ جۆری هەیە:

**یەکەم:** لە کاتێکدا بازرگانیکردن بە مرۆڤ بە مەبەستی دەرهێنانی ئەندامەکانی جەستەی شێوازێکە لە شێوازەکانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ وەک ئەوەی لە دەقی پرۆتۆکۆلی پالیرمۆ بۆ بەگژداچوونەوەی بازرگانیکردن بە مرۆڤ هاتوە لە ساڵی 2000، لە لایەکی تریشەوە درک بە هەبوونی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دەکرێت.

**دووەم:** بە "گەشتکردن بە مەبەستی چاندنی ئەندامەکان" ناسراوە، مەبەست لەمەیش گەشتکردنی ئەو کەسانەیە، کە سوودمەندن لە چاندنی ئەندامی جەستە لە دەوڵەتە پێشکەوتوەکانەوە بۆ دەوڵەتە تازەپێگەیشتوەکان، کە لەوێ دەخرێتە ژێر نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، کە لە بەخشەرە لۆکاڵییەکان کڕراوە. لە سایەی ئەمەیشدا، بازرگانیکردن بە ئەندامەکان

تەنها مانای گواستنەوەی ئەندامەکانی جەستە ناگەیەنێت، بەڵام گواستنەوەی کەسەکانە لە دەوڵەتە تازە پێگەییشتوەکانەوە بۆ دەوڵەتە پێشکەوتوەکان لە شێوە بازرگانیکردن بە مرۆڤ بە مەبەستی دەرهێنانی ئەندامانی جەستەیان بۆ بەدەستهێنانی پارە و پاشان ناردنەوەیان بۆ وڵاتە تازەپێگەییشتوەکانی خۆیان لە شێوەی گەشتیاری بۆ چاندنی ئەندامەکانی جەستە.

**سێیەم**: بریتییە لە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە واتا بەرتەسکەکەی، واتە گواستنەوەی نایاسایی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە نێوان دەوڵەتاندا.

ئەوەی ئەم هەڕەشە سنوربڕەی دروست کردوە دەگەڕێتەوە بۆ گەشەسەندنی پیشەسازیی چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە سەرانسەری جیهاندا، لە کاتێکدا دەرکەوتنی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ تەنها لە ئەنجامی ئەم جۆرە کارەوە نەبوە، بەڵکوو بە هۆی ئەو گاپ و کەلێنە زۆرانەوەیە، کە لە نێوان خواست لە سەر ئەندامانی جەستەی مرۆیی و خستنەڕووی

شەرعی و یاسایی ئەو ئەندامانەدا هەیە.

ئەم جۆرە بازرگانییە وەک هەموو کار و پیشە نهێنی و نایاساییەکانی تر وایە، بەڵام قەبارە و چوارچێوەی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ تا ئێستا بەوردی نەزانراوە. لە ڕاستیدا لە ساڵی 2004 هەوڵێک دراوە بۆ زانینی سەرچاوە و زانیاریی فراوانتر دەربارەی ئەم تاوانە کاتێک کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەککگرتوەکان بڕیارێکی پەسەند کرد سەبارەت بە "ڕێگریکردن و بەگژداچوونەوەی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ"، بەڵام ڕاپۆرتێکی تر کە لە لایەن سکرتێری گشتیی نەتەوە یەککگرتوەکانەوە دەرچوو ئاشکرای کرد، کە دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوە یەککگرتوەکان زانیاریی پێویستیان دەربارەی ئەم بابەتە نەداوە بە دەستەوە، ئەمەیش وای کردوە بەرەنگاربوونەوەی ئەم جۆرە بازرگانیکردنە لاواز بێت و تا ئەندازەیەکی زۆر سەرچاوەکانی ئاشکرا نەکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لەبەر ڕۆشنایی نەبوونی داتا و ئاماری فەرمی تەواو لەم بارەیەوە، زانیاریی زۆر لە سەرچاوە

نافەرمییەکانەوە دەربارەی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بوونی هەیە، ئاشکرای دەکەن کە ئەم جۆرە بازرگانیکردنە بە مەبەستی چاندنی ئەندامەکان بە شێوەیەکی نهێنی و نایاسایی ڕێژەی 10%ی سەرجەم حاڵەتەکانی چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە سەر ئاستی جیهان پێک دەهێنێت، کە داهاتی ساڵانەی دەگاتە 1,2 ملیار دۆلاری ئەمەریکی، کە بە داهاتێکی نامەشرووع دەدرێتە قەڵەم.

### میکانیزمە نێودەوڵەتییەکان

بە شێوەیەکی گشتی، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی شێوازی قەدەغەکردنی کار و چالاکییەکانی چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ پەیڕەو دەکات، بە واتایەکی تر دەوڵەتان کڕینوفرۆشتن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ قەدەغە دەکەن و ڕێگری لێ دەکەن. لە بەرانبەریشدا، ئەم پرۆسەیە بە شێوەی یاسایی کار لە سەر بەخشینی خۆویستانەی ئەندامانی جەستە دەکات لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی تر، کە ئەوپەڕی پێویستی پێیەتی، بەم شێوەیەش

چاندنی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، کە لە سەر بنەمای ئەخلاقی و ئاکاریی بونیاد دەنرێت، دەبێتە پاساوێکی ئەرێنی کاتێک دەبێتە کارێکی خۆویستانە بۆ بەخشینی ئەندامانی جەستە، چونکە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا خەڵکانێک پێکەوە کۆ دەکاتەوە، کە پێوەندیی پتەو و کرداریی پێکیانەوە دەبەستێتەوە.

لە ڕاستیدا پەیڕەوی قەدەغەکردنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە لە بۆتەی بنەماکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی لە ساڵی 1991 دەرچوو، کە ئاراستە کراوە سەبارەت بە چاندنی خانە و پێکهاتە و ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، بەڵام ئەم بنەمایانە پابەندکار (ملزم) نین و هەموو دەوڵەتانی جیهانیش پێوەی پابەند نابن، هەروەها ڕاگەیەنراوی ئەستەنبوڵ تایبەت بە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە و گەشتوگوزاری چاندنی ئەندامەکان ئامرازێکی تری نامولزیمە و لە ئەنجامی یەکێک لە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان لە ساڵی 2008دا پێشنیار کراوە. لە لایەکی ترەوە، ڕێکەوتننامەی مافەکانی مرۆڤ و پزیشکیی زیندەزانی و پرۆتۆکۆلی

پاشکۆی ساڵی 2002، کە ئەنجوومەنی ئەورووپا ئەنجامی داوە، بە هەمان شێوە کڕینوفرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤی قەدەغە کردوە، جگە لەمەیش ئەنجوومەنی ئەورووپا کار دەکات لە سەر پەیڕەوکردنی «ڕێکەوتننامەی قەدەغەکردنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ»، کە پێداگری دەکات لە سەر گرینگی و پێویستی بە هەبوونی بەڵگەنامەیەکی نێودەوڵەتیی پابەندکار لە ڕووی یاساییەوە، کە بە تایبەتی باس لە تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بکات و قەدەغەی بکات.

بە پێشبینیکردنی ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی ورد دەربارەی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، کۆماری بیلاڕووسیا لە نەتەوە یەکگرتوەکان ئەو دەرفەتەی قۆستەوە بۆ تاووتوێکردن و گفتوگۆکردن دەربارەی ئەم پرسی گرینگە و دانانی میکانیزمێکی جیهانی پابەندکار لە ڕووی یاساییەوە لە پێناو بەگژداچوونەوەی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، کە لە خولی حەوتەمی کۆنگرەی دەوڵەتانی

ئەندام لە ڕێکەوتننامەی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ بەگژداچوونەوەی تاوانی ڕێکخراو لە سەر ئاستی نێونەتەوەیی لە ڤیەننا بۆ ساڵی 2014 پێشکەش بکرێت لە پەراوێزی خولی نەوەدوشەشەمینی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتوەکان.

بناغەی لۆژیکیی بۆ داڕشتنی میکانیزمێکی نوێی چاوەڕوانکراو لە سەر بنەمای 3 تەوەری سەرەکی دەبێت:

1. پێویستبوون بە چارەسەرکردنی هۆکاری سەرەکی لە پشت بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، کە بریتییە لە کەمیی بێئەندازی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە بازاڕی تایبەت بەو کارە، کە لە بنەڕەتدا لە سەر ئەو گریمانەیە وەستاوە، کە هەموو هاوڵاتییەک لە ناو وڵاتدا ڕازی دەبێت تا ئەندامێکی جەستەی ببەخشێتە کەسێکی تر لە کاتێکدا کە ڕاشکاوانە ناڕازیبوونی دەرنەبڕیوە.

2. نەبوونی پێناسەیەکی یەکگرتوو، کە لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی پێکهاتنی لە سەر کرابێت بۆ دەستەواژەی "بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ".

3. پێویستە بەڵگەنامەیەکی گشتگیری تازە دابڕێژرێت بۆ چارەسەرکردنی هۆکارەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و لێکەوتە و بەرئەنجامەکانی. بە واتایەکی تر، پێویستە ئەم میکانیزمە چەند بنەمایەکی بنەڕەتی دابنێت بۆ سەرکۆنەکردن و بە تاوان ئەژمارکردنی بازرگانیکردن بە مرۆڤ بە گشتی و بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە تایبەتی. لە کاتێکدا زۆرێک لە دەوڵەتانی جیهانی بە کرداریی کڕینی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە تاوان دادەنێن لە ژێر چەتری دەسەڵاتی یاسایی ناوخۆییان، بەڵام تەنها ژمارەیەکی زۆر کەم لە دەوڵەتەکان کڕینی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە لایەن هاوڵاتییەکانیانەوە لە دەرەوەی سنورەکانیان، بە تاوان دەدەنە قەڵەم.

پێویستە میکانیزمێکی نوێ دابنرێت بە مەبەستی پتەوکردنی هاریکاریی نێودەوڵەتی لەم بابەتەدا، بە جۆرێک کە پشتی پێ ببەسترێت بە تایبەتی لە بوارەکانی وەک: ڕادەستکردنی تاوانباران، دەستبەسەرداگرتنی داهات و سەرچاوە داراییەکانیان، پێشکەشکردنی

هاوکاریی یاسایی هاوبەرانبەر. دوا جار، دارشتنی بەڵگەنامەیەکی نوێی تایبەت بەم تاوانە بە ئامانجی بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی گشتیی دەربارەی گرینگی بەخشینی ئەندامی جەستەی مرۆڤ بە شێوەیەکی خۆویستانە، تا دەگاتە ئاشناکردنی خەڵک بەو هەڕەشە و مەترسییانەی کە تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە سەر کۆمەڵگەکان دروستی دەکات.

لە کاتێکدا بازرگانیکردن بە مرۆڤ بە مەبەستی دەرهێنانی ئەندامانی جەستە دەچێتە چوارچێوەی پابەندبوونی یاسایی "پرۆتۆکۆلی پالێرمۆ بۆ بەگژداچوونەوەی بازرگانیکردن بە مرۆڤ"، بەڵام هەر یەک لە گەشتکردن بۆ چاندنی ئەندامانی جەستە و بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ناچێتە ژێر پابەندێتیی یاسایی بە ناوەرۆکی پرۆتۆکۆلی پالێرمۆ. لە ڕاستیدا ئەژمارکردنی ئەم تاوانە لە پاڵ تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ بۆی هەیە ببێتە فاکتەرێک بۆ سنورداركردنی بە تەواوی و کەمکردنەوەی ئاڵۆزییەکانی.

## کاریگەری و لێکەوتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی دیاردەی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە

مەترسیی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی ئادەمیزاد لەو لێکەوتە و کاریگەرییانەدا خۆی دەبینێتەوە، کە بوونەتە دەردی تاکەکان لە کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی و ئابووریی دەوڵەتانی شپرزە کردوە، کاریگەری و لێکەوتەکانیشی تەنها لۆکاڵی نیین، بەڵکوو بوەتە دیاردەیەکی نێودەوڵەتی و چوارچێوەیەکی فراوانی هەیە، لەبەر ئەوە گرینگە قسە لە سەر ئەم لێکەوتە

و كاریگەرییانە بکەین، کە لە ئەنجامی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دروست دەبێت، بە دیاریکراویش کاریگەرییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان.

**یەکەم:** لێکەوتە و کاریگەرییە ئابوورییەکان

ئەوەی ئاشکرایە ڕەگەزی مرۆیی یەکێکە لە کۆڵەکە بناغەیی و سەرەکییەکانی ئابووریی هەموو دەوڵەتێک، بۆیە دەوڵەتە پێشکەوتوەکان بەردەوام لە هەوڵدان بۆ گەشەپێدانی ئەم سەرچاوە مرۆییە بە گرتنەبەری هەموو ڕێگە و شێوازێک، سەرەتا لە پەروەردەکردنی دروستی تاکەکان تا دەگاتە شیاندن و ڕاهێنانیان، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا هەندێک دیاردەی تاوانکاریی دەرکەوتن، کە کاریگەریی نەرێنییان لە سەر تاک و کۆمەڵگە جێ هێشتوە، لەوانەیش دیاردەی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی ئادەمیزاد.

تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ چەند ڕێگە و دیوێکی هەیە، کە دیارترینیان ئەمانەن:

1. سەرهەڵدانی ڕۆڵی نوێی گروپ و کۆمەڵە

و باندەکانی تاوانی ڕێکخراو، کە کاریگەرییان هەیە لە سەر وردی ڕێکارە ئابوورییەکان لە سەر ئاستی هەرێمی و جیهانی.

2. بەشداریکردنی کەسانی شارەزا و پرۆفیشناڵ، کە پێگەی بەهێز و کاریگەرییان لە ئابووری دەوڵەتدا هەیە، لە ناو ڕیزی باند و مافیاکانی تاوانی ڕێکخراو بۆ بەدیهێنانی خواست و ئامانجەکانیان.

3. هەوڵدانی دەوڵەتانی تازە پێگەییشتوو لە سەر کەڵکوەرگرتن لە سەرمایەگوزاری بیانی گوازراوە بۆ ئەو وڵاتانە، بە بێ گرینگیدان بە سەرچاوەی سەرمایەکە (سپیکردنەوەی پارە، بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە و...هتد)، ئەوەیش بە ئامانجی جێبەجێکردنی پلانەکانی گەشەپێدان، سەرەڕای کاریگەریی ئەو لێکەوتە نەرێنییانەی، کە لە داهاتوودا زیان بە ئابوورییان دەگەیەنێت.

4. گۆڕینی ڕوانین بۆ تاوانی ڕێکخراو و دانانی بە دیاردەیەکی نێودەوڵەتی لە ئەنجامی فراوانبوونی بازاڕی زانستیی تایبەت بە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ.

5. گۆڕانی خێرا سەبارەت بە چەمکی جیهانیی سیستەمەکان و کاریگەرییان لە سەر هەمواری ڕیشەیی چوارچێوەی کاری ڕێکخراوە تاوانکارەکان لە بواری بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و پارێزگاریکردنیان لە پەرەپێدانی فۆرمە لۆکاڵییەکانیان بۆ ئەوەی ببنە ڕێکخراوی تاوانکاریی نێودەوڵەتی کیشوەربڕ.

6. هەوڵدانی ڕێکخراوەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بۆ پەلهاویشتن و فراوانکردنی کار و چالاکییەکانیان لە ڕێگەی بەرپرسە نیشتیمانییەکانەوە بۆ ئەوەی بتوانن دەست بە چالاکییەکانیان بکەن لە ڕێگەی سنوری وڵاتەکانیانەوە، بە تایبەتییش دەوڵەتە هەژارەکان.

7. دەرکەوتنی چەند نەریتێکی ئابووریی ناتەندروست، کە گرینگترینیان بریتییە لە هاندانی مامەڵە و ئاڵوێرە گوماناوییەکان، وەبەرهێنان، بەدەستهێنانی قازانجی خێرا و کورتمەودا، هەوڵدان بۆ دروستکردنی کاریگەری یان فشار خستەسەر سواڵکەرەکان، زاڵبوونی هەڵسوکەوتی خۆدزینەوە لە پێدانی باج.

8. کەمبوونەوەی تێکڕاکانی گەشەکردنی ئابووری لە کۆمەڵگەدا.

9. شڵەژان و لەرزۆکبوونی گەشەپێدانی ئابووری و گومانکردن لە توانا و شەرعیەتی سیستمی سیاسی، بە شێوەیەک کاریگەری دروست دەکات لە سەر سەقامگیریی دۆخی ئابووری.

10. زیانگەیاندن بە پلانە ئابوورییەکان و پاراستنی کۆمەڵایەتی.

11. دروستبوونی هەستکردن بە ترس لە لای جەماوەر و لەدەستدانی متمانە.

12. هاندانی گەنجان بۆ کۆچکردن لە ڕێگەی بەڵێنپێدان یان گرێبەستی ساختەوە، ئەوەیش دەبێتە هۆکاری لەدەستدانی ژیانیان.

13. بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی درم لە ناو تاکەکانی کۆمەڵگە، بە تایبەتی توێژی گەنجان، ئەمەیش ڕەنگدانەوەی دەبێت لە سەر کەمکردنەوەی توانا و ئاستی بەرهەمهێنان.

14. زیادبوونی بارگرانی لە سەر ئەستۆی دەوڵەت، لە ڕووی دابینکردنی چاودێریی تەندروستی و کۆمەڵایەتی بۆ ئەو کەسانەی دەبنە قوربانیی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ.

**یەکەم:** لێکەوتە و کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکان

لە کتێبخانەکانەکاندا توێژینەوەیەکی زانستییانەی ورد و گشتگیر سەربارەت بەم بابەتە نابینی، ئەمەیش لەبەر فرەیی پێکهاتەکانی و ناتۆکمەیی سنورەکانی نێوان ئەو پێکهاتە و ڕەگەزانە، لە پاڵ چەند بابەتێکی تردا، کە پێوەندییان پێوەی هەیە، جگە لەمەیش ئەو ڕەگەز و پێکهاتانە هێشتا جێگەی مشتومڕن لە نێوان کەسانی تایبەتمەندی ئەم بوارە، سەرەڕای ئەوەی ئەم پێکهاتانە هێشتا بوونەتە جێی مشتومڕێکی زۆر لە نێوان خاوەن پسپۆڕی و تایبەتمەندییەکان، بە تایبەتی ئەوەندەی پێوەندیدارە بە ماف و ئازادیی مرۆڤ لە ڕووی مامەڵەکردن بە ئەندامەکانی جەستەی بە زیندوویی یان ڕاسپاردن بە بەخشینی لە دوای مردنی، لەم ڕوەیشەوە جیاوازی هەیە سەبارەت بە دیاریکردنی چەمکی مردن (وەستانی مێشک) یان مردنی خانەکانی مێشک، یان مردنی بەشەکیی خانەکانی مێشک. ڕێکخراوی ئیسلامی بۆ زانستییە پزیشکییەکان لە خولی دوەمیدا لە ساڵی 1995 دەربارەی

مردنی مێشکی مرۆڤ، بڕیاری داوە کە هەر کەسێک لەم دوو حاڵەتەدا بە مردوو ئەژمار دەکرێت:

1. لە کاتی وەستانی تەواوەتیی کۆئەندامی هەناسەدان و ئەندامی دڵی مرۆڤ.

2. لە کاتی وەستانی تەواوەتیی خانەکانی مێشک بە بێ گەڕانەوە، لە دوای لێکۆڵینەوەی پزیشکی کارپێکراو لەم بابەتە بە پێی پێوەرە پزیشکییەکان.

چەند خاڵێکی تری جیاوازی بوونی هەیە، وەک یاساییبوونی گواستنەوەی ئەندامانی جەستە یان مامەڵەپێوەکردنی، لە کاتێکدا زۆرێک لە شەرعزانان و یاسادانەران لایەنگریی ئەو بۆچوونە دەکەن، کە دەڵێت: نابێت ئەندامی جەستە لە کەسێکی زیندوو یان مردووەوە بگوازرێتەوە و لە جەستەی مرۆڤێکی تردا بچێنرێت بە پێی چەند مەرجێکی وەک:

1. بوونی حاڵەتێکی پێویست و بەپەلە، کە وەستاوە لە سەر چاندنی ئەندامێکی جەستە.

2. لە کاتی گواستنەوەی دڵ و چاندنی بۆ کەسێکی تر پێویستی دڵنیایی تەواو لە مردنی خاوەنەکەی هەبێت.

3. دەبێت مۆڵەت لە کەسی بەخشەر وەربگیرێت.

4. مامەڵەکردن بەوریاییەوە لەم بابەتە بۆ ئەوەی نەبێتە پاساوێک بۆ کوشتنی کەسەکان و کردنەوەی دەرگای بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ.

5. پێویستە ئەم کارە لە بەرانبەر وەرگرتنی پارەدا نەبێت.

6. نابێت ئەو ئەندامانەی مرۆڤ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بگوازرێتەوە، کە پێچەوانەیە لەگەڵ شەریعەت، بۆ نموونە وەک گواستنەوەی گون و هێلکەدان.

7. پێویستە دەستەبەری زیانی کەسی بەخشەر بکرێت و پرۆسەکە دوور بێت لە گومانبردن بە سوودوەرگرتنی بەخشەران لەو کارە.

## کاریگەرییەکانی بازرگانیکردن
## بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ
## لە سەر کۆمەڵگە

1. پێشێلکردنی بنەما شەرعییەکان و سەرپێچیکردنی ئەو یاسا دانراوانەی کە ئەم جۆرە بازرگانییەیان قەدەغە کردوە. کۆنگرێسی ئەمەریکا لە ساڵی 1984وە فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤی قەدەغە کردوە، بەڵام دامودەزگا تەندروستییەکان کاریان لە سەر ئەوە کردوە تا مۆڵەت بدرێتە پرۆسەی فرۆشتنی

ئەندامانی جەستە و ڕێگەپێدان بە بەخشەران تا لە بەرانبەر فرۆشتنی ئەندامانی جەستە یان خانەکانی لەشیان بە نەخۆشان، بڕێک پارە وەربگرن، لە کاتێکدا کە 80000 نەخۆش ناویان لە سەر لیستی چاندنی ئەندامەکان تۆمار کراوە، بەڵام نزیکەی 15000 کەسیان پێش ئەوەی ئەندامانی پێویستی جەستەیان پێ بگات دەمرن.

2. بەرزبوونەوەی کۆی گشتیی تاوانەکانی ڕفاندن و فێڵکردن و هەڵخەڵەتاندن، کە ناهێڵێت سەقامگیریی کۆمەڵایەتی و ئاساییشی کۆمەڵگە بەردەوام بێت و لە باری دەبات. توێژینەوەی بنکۆڵکاریی سێیەمی نەتەوە یەکگرتوەکان سەبارەت بە ئاراستەکانی تاوان و پرۆسەکانی ڕێکخستنی ڕێڕەوی دادپەروەری بەرزبوونەوەی ڕێژەی تاوانەکانی ڕفاندن نیشان دەدات.

3. زیادبوونی بازاڕی ڕەش تایبەت بە کڕینوفرۆشتنی ئەندامانی جەستە.

4. دەرکەوتنی ئاستەنگی ئەخلاقی، کە هەڕەشە دەکات بە هەرەسهێنانی سیستمە تەندروستییەکان لە کۆمەڵگەدا، بە تایبەتی

کاتێک نەخۆشەکە دزینی ئەندامەکانی جەستەی بۆ دەردەکەوێت، بە تایبەتی لە کاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەرییە ئاساییەکاندا.

5. دروستکردنی ئەڵتەرناتیڤی خانە جیناتییەکان «کۆپیکردنی خانەکان»، کە لەوانەیە بە شێوەیەکی ناتەندروست گەشە بکات، یان خانەی ناسروشتی بەرهەم دەهێنێت ئەمەیش نارەزایەتیی ئاکاریی لێ دەکەوێتەوە.

6. لەناوبردنی بەها و بنەما سەرەکییەکان سەبارەت بە چەمکی کەرامەتی مرۆڤایەتی و مافی مرۆڤ لە ڕووی مامەڵەکردن بە ئەندامانی جەستەی.

7. تێکەڵاوکردنی ڕەچەڵەکەکان بە تایبەتی کاتێک بابەتەکە پەیوەندیدارە بە گواستنەوەی ئەندامەکانی زاوزێی پیاو یان ژن.

8. بەکارهێنانی ئەنجامە نەرێنییەکان لە نەشتەرگەرییەکانی چاندن بۆ نیشاندانی شکستهێنانی نەشتەرگەرییەکانی چاندنی ئەندامەکان لە لای کەسانی بەخشەر و وەرگر پێکەوە.

گرینگترین کاریگەرییەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە لە سەر ئەو کەسەی پێی دەدرێت.

ئەو کەسەی ئەندامێکی جەستەی پێ دەدرێت، کەسێکە ئەندامێکی کەسی بەخشەری بۆ دەچێنرێت لەو شوێنەی، کە لە ڕووی پزیشکی و بایۆلۆژییەوە بۆی دیاری کراوە، بەڵام ئەم کارە چەند کاریگەرییەکی لە سەر کەسی وەرگر هەیە:

1. هەستکردن بە پەشیمانی و لەدەستدانی متمانە لە حاڵەتی شکستهێنانی نەشتەرگەرییەکە و جەستەی ئەو ئەندامە گواستراوەیە قبوڵ ناکات.

2. شێوانی تەونی خێزانی لە ئەنجامی هەستانی یەکێکیان بە بەخشینی ئەندامێکی جەستەی بە کەسێکی نەخۆش لە خێزانەکە.

3. خراپیی ئەو کاریگەرییە ئابوورییانەی بە هۆی تێچوونی زۆری ئەم نەشتەرگەرییانە و چاودێریی تەندروستی دروست دەبێت.

4. هەستکردن بە نیگەرانی لە کاتی بینینی

کەسی بەخشەری ئەندامەکە لە ئەنجامی ترسان لە لۆمە و ڕەخنەگرتن.

5. هەمیشە هەستکردن بەوەی کەسێک تۆڵە لە خۆی و ئەندامانی خێزانی کەسی بەخشەر بکاتەوە.

6. هەست نەکردن بە ئارامی و ئاسوودەیی بە هۆی ڕاوەدوونـــان و تەنگەتاوکردنی لە لایـەن پیاوانی لێکۆڵینەوە بۆ ئاشکراکردنی مافیا و باندەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ.

7. زۆربـوونـی ئاستی سووکایەتیپێکردن و بێزارکردنی لە لایەن پزیشکەکان یان ئەو کەسەی ئەندامی جەستەی پێ فرۆشتوە یان لە لایەن هەمان ئەو مافیایەوە، کە بۆی پەیدا کردوە.

8. لـەدەسـتـدانـی متمانە بـە کەسایەتیی پزیشک، کـە وەک یەکێک لـە فریشتەکانی ڕەحمەت تەماشا دەکرێت.

ئـامـانـجـی ئـەم تـوێـژیـنـەوەیـە بریتییە لـە شـیـکـردنـەوەی یەکێک لـە گرینگترین

دیارده ئابوورییه مەترسیدارەکان له سەر ئابووریی جیهانی هاوچەرخ، که دیاردەی بازرگانیکردنه به مرۆڤ، لێکەوته و کاریگەرییەکانیشی دەکەوێته سەر ئابووریی دەوڵەته دەوڵەمەند و پێشکەوتوەکان و هەژار و دواکەوتوەکان پێکەوه، له پاڵ هەڵکشانی بەردەوامیی ئەم دیارده مەترسیداره له سەدەی ڕابردوو سەدەی بیستویەکەمیش، جگه له کاریگەریی نەرێنیی ڕاستەوخۆی ئەم بازرگانیکردنه له سەر سەرچاوه مرۆییەکان.

له ڕاستیدا بوونی دیاردەی بازرگانیکردن به مرۆڤ به هەموو سیما و وێنەکانییەوه، به تەنها نابێته هۆی شێواندنی داتا و ئامارەکانی تێکڕای داهاتی نەتەوەیی دەوڵەت، بەڵکوو ئەم بازرگانیکردنه بوەته سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ دەوڵەمەندکردنی ئابووریی ڕەش، که له داهاتوودا دەبێته یەکێک له دیارده ئابوورییه باوەکان له ناو ئابووریی دەوڵەتانی جیهان، ئەمەیش بێگومان کاریگەریی نەرێنیی قورسی

دەبێت لە سەر یەکلاییکردنەوەی پەیکەرەکانی داهــات و هـێزی کــار و بــەرزبــوونــەوەی تێکڕاکانی بێکاری و ناسەقامگیریی نرخەکانی دراوی نیشتیمانی، سپیکردنەوەی پـارە و شـێواندنـی سیستمی بـاج. ئـەو لـێکـەوتـە و کاریگەرییانەی لەم تاوانە دەکەوێتەوە هەر چی زوە پێویستی بە یەکخستنی هـەوڵ و تەقەللا نیشتیمانی و نێودەوڵەتییەکان هەیە لە پێناو دانانی سنورێک بۆ مەترسییەکانی لە سەر تۆکمەیی و وابەستەبوونی کۆمەڵگەکانی مـرۆڤـایـەتـی. لـەبـەر زۆریــی مەترسییەکانی ئەم دیـاردە تاوانکارییە پێویستە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی چەند میکانیزم و ستراتیژێکی کاراتر و کاریگەرتر بدۆزێتەوە بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی یان سنوردانان بۆ لێکەوتە و کاریگەرییەکانی، لانـی کـەم نەهێشتنی ئەم دیاردەیە تا مرۆڤ لە هەموو شـوێنێک ژیانێکی شکۆمەندانەی هەبێت و مافەکانی وەربگرێت و ئاشتی و پێکەوەژیان لە نێوان دەوڵەتانی جیهاندا دروست بێت.

1. پێشکەوتنی زانستی لە بواری پزیشکی و نەشتەرگەریدا یارمەتیدەرە بۆ گەشەسەندنی دیاردەی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە مەبەستی بەکارهێنانی لە چارەسەرکردنی دەولەمەندە نەخۆشەکان و بەکارهێنانیان لە توێژینەوە زانستییەکان و زانینی ئاستی سەرکەوتنی تاقیکردنەوە پزیشکییەکان ئەوەیش لە دەرەوەی چوارچێوەی ئازادییە مەشرووع و ڕێکخراوەکان بە شێوەیەکی فەرمی، کە بوەتە هۆی زیادبوونی دیاردەی هەژاری و نەداری و بڵاوبوونەوەی زیاتری ئەم بازرگانیکردنە و ڕووبەڕووکردنەوەی ژیانی ملیۆنان مرۆڤی هەژار بە چەندین کێشەی تەندروستی یان مردنیان بە بێ لەبەرچاوگرتنی کەمترین مافی مرۆڤ و ئادەمیزاد بە گشتی.

2. زیادبوون و هەڵکشانی دیاردەی کۆچی نایاسایی لە سایەی هاوکێشە خێراکاندا بە هۆی کەمیی دەرفەتی کار لە دەوڵەتە تازە پێگەییشتوەکاندا ڕۆڵی هەیە لە زیادبوونی ڕێژەکانی بێکاری و بڵاوبوونەوەی هەژاری و نەداری لە ناو هاوڵاتییانی ئەو دەوڵەتانە، کە هۆکارە بۆ زیادبوونی ئەم تاوانە مەترسیدارە.

3. بە پلەی یەکەم هەژاری هۆکاری سەرەکییە بۆ سەرهەڵدان و گەشەسەندنی دیاردەی بازرگانیکردن بە مرۆڤ لە سەر ئاستی جیهانی، پاشان بابەتی هەژاری بوەتە جێی گرینگپێدانی سەرجەم ناوەند و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و زیادبوونی خواست و داواکارییەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، بۆیە پێویستە دەوڵەتانی دەوڵەمەند و پێشکەوتوو بەرەنگاری ببنەوە و بەرپرسیارێتیی بگرنە ئەستۆیان لە پێناو دانانی سنورێک بۆ هەژاری و کەمکردنەوەی کاریگەرییە وێرانکارییەکانی لە دەوڵەتانی تازەپێگەییشتوو.

4. بەکارهێنانی نوێترین میکانیزم و شێوازەکانی تەکنۆلۆژیای نوێ لە لایەن باند و مافیاکانی تاوانی ڕێکخراو لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی، بوە هۆی کارئاسانیکردن بۆ بەدیهێنانی خواست و ئامانجەکانیان لە لایەک و سەپاندنی زۆرێک لە سزا بە سەر چۆنێتیی بەرهەڵستی و بەرەنگاربوونەوەیان و لێپێچینەوە و دادگاییکردنیان لە لایەکی ترەوە.

5. کەمتەرخەمی یاساکانی زۆرێک لە دەوڵەتە تازەگەشەسەندوەکان، بە تایبەتیش لە بەرەنگاربوونەوەی تایبەتمەندی و پسپۆڕیی کاراکتەرەکان لە دیاردەی بازرگانیکردن بە مرۆڤ.

**ڕاسپاردەکان**

لەبەر ڕۆشنایی ئەو لێکەوتە و کاریگەرییە نەرێنییانەی، کە دیاردەی بازرگانیکردن بە مرۆڤ بەرجەستەیان دەکات، دەکرێت گرینگترین ئەو ڕاسپاردانەی بۆ بەرەنگاربوونەوە و چارەسەرکردنی دیوە نەرێنییەکانی ئەم دیاردەیە پێشنیار کراوە لەم چەند خاڵەدا کۆیان بکەینەوە:

1. گرینگیدان بە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری لە ڕێگەی کەناڵەکانی میدیا و فۆکس خستنە سەر لایەنە خراپ و نەرێنییەکانی دیاردەی بازرگانیکردن بە مرۆڤ و ئەندامانی جەستەی مرۆڤ.

2. گرینگپێدان بە بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی ڕۆشنبیری و کولتووری بە گشتی و هۆشیاریی دینی بە تایبەتی لە پاڵ کارکردن لە سەر بەرپەرچدانەوەی یاسایی و مەترسییە تەندروستییەکانی ئەم دیاردەیە لە ناو ژنان و منداڵان لەگەڵ نەهێشتنی سەرچاوەکانی بەکارهێنانی مرۆڤ بۆ مەبەستی سێکسی و بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە.

3. زۆر پێویستە گرینگی بدرێت بە هۆشیاری

دینی و کاراکردنی شوێنەکانی خواپەرستی و ڕۆشنبیرکردنی بانگخوازان سەبارەت بە مەترسییەکانی بەردەوامبوونی ئەم دیاردەیە لە ناو کۆمەڵگەدا، چونکە دین قەڵغانی پاراستنی کۆمەڵگەیە لە ڕۆچوون لە ناو ئەو ڕیسواییەدا.

4. پێویستە هەموو دەوڵەتانی جیهان کار بکەن لە سەر پەسەندکردنی ڕێکەوتننامە و پەیمانە و پرۆتۆکۆلە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە مافەکانی منداڵان و ژنان لە پێناو نەهێشتن و ڕێگرتن لە تەشەنەکردنی ئەم دیاردەیە.

5. پێویستە ڕێگە نەدرێت بە تەنها هاوڵاتییانی دەوڵەتە هەژار و تازە گەشەسەندووەکان خراپی و مەترسییەکانی پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژیی بێئەندازی جیهان بکەوێتە ئەستۆیان بە هۆی کەڵکوەرگرتن لە هەژاری و پێویستییەکانیان تا لە توێژینەوە زانستییەکان و بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە کاریان بهێنن.

6. گرینگیدان بە پێدانی یارمەتیی تەکنیکی و ڕاهێنانی هێزەکانی پۆلیسی ناوخۆ لە لایەن ڕێکخراوەکان و دەزگا نێودەوڵەتییەکانی

وەک یونسیف، ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی، کۆمسیۆنی ڕێگرتن لە تاوان، کۆمسیۆنی دادپەروەریی جینائی، ڕێکخراوی پێوەندیدار بە نەهێشتنی تاوان، دەزگای دادپەروەریی جینائی سەر بە نەتەوە یەککگرتوەکان بۆ پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی و کاروبارە مرۆییەکان و کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤ بۆ بەگژداچوونەوە و نەهێشتنی بازرگانیکردن بە مرۆڤ بە هەموو جۆر و شێوازەکانیەوە.

7. بەگژداچوونەوەی هەژاری و بێکاری لە جیهاندا بە شێوەیەکی گشتی، ئەوەیش لە ڕێگەی پاڵپشتیکردن و هاوکاریکردنی دامەزراوەکانی کۆمەڵی مەدەنیی تایبەتمەند و بەرزکردنەوەی ئاستی تواناکانی و میکانیزمی کارکردنیان، بەڵکوو ئامادەکردن و کاراکردنیان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی هەژاری و یارمەتیدانی خێزانە هەژار و نەدارەکان تا نەکەونە داوی باند و مافیاکانی بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە.

## بەرپرسیارێتیی سزایی لە بەرانبەر تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

بێگومان تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ یەکێکە لەو تاوانانەی، کە پێشێلکارییەکی زەقە لە بەرانبەر هەموو ماناکانی مرۆڤایەتی، لەبەر ئەوەی دەستبردنە بۆ سەلامەتیی جەستە و ئەندامەکانی، کە پێکەوە بە شێوەیەکی تەواوکاریی کار دەکات بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە زیندەییەکانی. ئەم تاوانە لە ڕیزی تاوانە هەرە مەترسیدارەکاندا

پۆلێن دەکرێت، چونکە سنوری یەک دەوڵەت دەبەزێنێت بەرەو ڕوانگەی جیهانی، وەک هەمیشەیش کۆمەڵێکی زۆر لە تاوانکاران بەشداری دەکەن لە ئەنجامدانی ئەم تاوانە لە ژێر ناوی جۆراوجۆری وەک: ناوەندگیریکردن، دەڵاڵی، کڕیار و فرۆشیار.

بەگژداچوونەوەی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ پێویستی هەیە بە یەکخستنی هەموو هەوڵ و تەقەللا نێودەوڵەتییەکان بە مەبەستی نەهێشتنی و دارشتنی سیاسەتی تۆکمە لە سەر ئاستی نیشتیمانی و نێودەوڵەتی لە پێناو شوێنکەوتن و لێپێچینەوە لە تاوانباران وەک زەمینەخۆشکردن بۆ ڕاپێچکردنیان بۆ دادگا. لە دوایین دەیەی ئەم سەدەیەدا گرینگیپێدانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی کەوتە سەر زاڵبوون بە سەر ئەو کۆسپ و ئاستەنگانەی، کە تاوانی هاوچەرخ هێناویەتە ئاراوە و سەپاندوویەتی، لەوانەیش تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ. بواری زانستی پزیشکی سەرکەوتنی گەورەی بە دەست هێناوە لە ڕووی

گواستنەوەی هەندێک لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، ئەمەیش هیوای لە دڵ و دەروونی زۆرێک لە نەخۆشەکاندا بووژاندەوە و بواری پێ دان بۆ چاندنی ئەندامەکان کەسانێکی ساغ لە ناو جەستەی کەسانێکی نەخۆشدا، کە ئەمەیش ڕزگاریان دەکات لە ئازار و وەرگرتنی چارەسەری ماوەدرێژی وەک شتنی گورچیلە، بەڵکوو باشتر پارێزگاری لە ژیانیان دەکات. سەرەڕای ئەوەی کە زۆرێک لە یاساکان و ئەو فەتوایانەی ڕێگە دەدەن بە بەخشین و ڕاسپاردەیی بە بەخشینی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، بەڵام ئەمە پێویستییەکان بە تەواوەتی دابین ناکات، تا ئەندامەکان بگوازرێنەوە و بۆ نەخۆشەکان دابنرێت، نەک بە هۆی نەگونجانی فسیۆلۆژی یان پزیشکی لە نێوان جەستەی کەسی بەخشەر و کەسی نەخۆش (وەرگر) دا، بەڵکوو کێشەکە بە شێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ پاشگەزبوونەوە لە بەخشین و ڕاسپاردن بە بەخشین لەبەر چەند هۆکارێکی کۆمەڵایەتی و تەندروستیی پەیوەست بە کۆمەڵگە و سروشتی مرۆڤەوە.

**چەمکی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە و سەلامەتیی جەستەی مرۆڤ**

بنەمای بنەڕەتی لە فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بریتییە لە قەدەغەکردنی، چونکە یاسای شارستانی مەرجی داناوە بۆ ڕاستیودروستیی گرێبەستی فرۆشتن، بەوەی کە دەبێت هۆکاری گرێبەستکردنی ڕەوا بێت، واتە دەبێت ئەندامی جەستەی مرۆڤ لەو شتانە بێت، کە دەچنە ناو بازنەی مامەڵەکەوە، هەروەها هۆکاری ڕێکەوتنەکە پێویستە مەشرووع بێت واتە پێچەوانەی سیستمی گشتی و بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامی نەبێت، کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی یاسای مەدەنی لە یاساکانی زۆربەی وڵاتانی عەرەبی.

گومانی تێدا نییە کە بە تاوان ئەژمارکردنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ جگە لە بەرئەنجامی پارێزگاریکردن لە مافەکانی مرۆڤ و پاراستنی سەلامەتیی لەش و جەستەی شتێکی تر نییە، لە کاتێکدا پێوەر و بنەما نێودەوڵەتییەکان و یاسا سزاییەکانی وەک یاسای سزادان بەرگریی لێ دەکەن، کە بە یاسایەکی گشتی دادەنرێت لە بەرانبەر سەرجەم

یاسا پێوەندیدارەکانی تردا، وەک یاساکانی ڕێگرتن لە بازرگانیکردن بە مرۆڤ و یاساکانی سوودوەرگرتن لە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، کە بە یاسا تایبەتەکان دادەنرێن. لەبەر ئەوەی کە تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بوەتە پێشێلکارییەکی زەق لە بەرانبەر مافی پاراستنی سەلامەتیی جەستە، لەبەر ئەوە بە وردی هەڵوەستە دەکەین لە سەر چەمکی ئەندامی جەستەی مرۆڤ و بازرگانیپێوەکردنی، لەگەڵ دیاریکردنی ناوەڕۆکی مافی خەڵک لە پاراستنی سەلامەتیی جەستەیان.

**یەکەم:** پێناسەی زمانەوانیی ئەندامی جەستەی مرۆڤ و چاندنی

لەشی مرۆڤ لە کۆمەڵێک ئەندامی گرینگ پێکهاتوە، کە هەر یەکەیان وەزیفە و کاری خۆی هەیە، ئەندامەکانیش لە خانە پێکهاتوە، کە یەکەی سەرەکییە لە پێکهاتنی جەستە، کە هەموویان پێکەوە کۆئەندامی جۆراوجۆری لەش پێک دەهێنن. شێخ عەبدوڵڵا ئەلبوستانی لە کتێبی (الوافی)دا بەم شێوەیە پێناسەی ئەندامی جەستەی کردوە: بەشێکە لە جەستەی مرۆڤ وەک دەست و قاچ و لووت و گوێ.

مشتومڕێک دروست بوە لە سەر خوێن، کە ئایا بە ئەندامێک لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ دادەنرێت یان نا. هەندێک پێیان وایە خوێن ئەندامێکی جەستەی مرۆڤ نییە لەبەر ئەوەی کە شێوەیەکی دیاریکراوی نییە، بەڵام هەندێکی تر پێیان وایە خوێن ئەندامێکی جەستەیە بە مانا کلاسیکییەکەی لەبەر ئەوەی کە پێکهاتەیەکە لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو لە ناو ماددەیەکی شل دروست بوە، کە پێی دەگوترێت پلازما و پرۆتینیشی لە خۆ گرتوە و ئەرکی جۆراوجۆری لەشی مرۆڤ ڕادەپەڕێنێت.

### پێناسەی ئەندامی جەستەی مرۆڤ

«بریتییە لە بەشێک لە خانە و خوێن و پێکهاتەی جەستەی مرۆڤ، ئەگەر پێوەی بەستراو بێت یان جیاکراوە بێت لێی. هەندێک لە زانایان و شارەزایان پێیان وایە خوێنیش ئەندامێکە لە ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ، چونکە کۆمەڵێک خانەیە پێکەوە کار دەکات بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی دیاریکراو، وەک دڵ و جگەر و گورچیلە و خانەکانی مێشک و ئەندامەکانی زاوزێکردن و...هتد.

**دووەم: مافی پاراستنی جەستەی مرۆڤ**

پەیام و سروتە ئاسمانییەکان و یاسا دانراوەکان گرینگیان داوە بە پاراستنی مرۆڤ و سەلامەتیی جەستەی لە هەر دەستدرێژییەکی دەرەکی، هەر وەک پاراستنی ژیان و سەلامەتیی مرۆڤ یەکێکە لە پێشەنگی کاری ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان. بەڵگەکانی ڕێزلێنانی مرۆڤ لە قورئان و فەرمودەدا ڕوون و بەرچاوە، واتا ڕێزگرتنە لە خودی مرۆڤ و ڕۆح و جەستەی. لە سورەتی (التین) لە قورئاندا هاتوە: "والتين والزيتون وطور سينين وهذا البلد الامين، لقد خلقنا الانسان فى احست تقويم".

لە یاسای نێودەوڵەتییشدا لە دیباجەی ڕێکەوتنی نێودەوڵەتی بۆ مافە مەدەنی و سیاسییەکان لە ساڵی 1966دا هاتوە: "دەوڵەتانی ئەندام لەم ڕێکەوتنەدا پێیان وایە سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵی مرۆڤایەتی خاوەنی شکۆ و کەرامەتی ڕەسەنی خۆیانن، خاوەنی مافی یەکسان و جێگیر کراون، کە بە پێی بنەما ڕاگەیەنراوەکانی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان، دەبنە بناغەی ئازادی و ئاشتی و دادپەروەری

لە جیهاندا، دانی بەوەشدا ناوە کە ئەم مافانە لە شکۆ و کەرامەتی ڕەسەنی مرۆڤەوە هەڵقوڵاوە"، بەڵام لەم ڕێکەوتنەدا هیچ ماددەیەک نییە باسی مافی پاراستنی سەلامەتیی جەستەی کردبێت، بەڵام چەند ماددەیەکی تری باسیان لە مافی ژیان، قەدەغەکردنی ئەشکەنجەدان کردوە، کە پێویستە یاسا پارێزگاری لەم مافە بکات و نایشبێت هیچ کەسێک بە زۆر و بە زەبری هێز لە ژیان بێبەش بکرێت (ماددەی 6/ بڕگەی 1)، هەروەها نابێت هیچ کەسێک ڕووبەڕووی ئەشکەنجەدان، مامەڵەکردنی توند و خراپ و نامرۆڤانە بکرێتەوە یان کەرامەتی لەکەدار بکرێت، بە تایبەتیش نابێت هیچ تاقیکردنەوەیەکی پزیشکی یان زانستی لە سەر هیچ کەسێک بکرێت بە بێ وەرگرتنی ڕەزامەندیی کەسەکە بە شێوەیەکی سەربەستانە (ماددەی 7). هەروەها یاسا دانراوەکان باسیان کردوە، کە مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە کەڵک لە هێزە جەستەیی و دەروونییەکانی خۆی وەربگرێت بەو شێوەیەکی کە خوای گەورە لە سەرەتای لەدایکبوونەوە پێی بەخشیوە تا گیانلەدەستدانی،

بەڵکوو ئەم یاسایانە هەموو جۆرە دەستدرێژی و دەستکاریکرنێکیان بۆ سەر جەستەی مرۆڤ قەدەغە کردوە ئەگەر ماددی بێت یان مەعنەوی، جگە لەمەیش هەموو یاسا و ڕێساکان لە سەر ئەوە کۆکن، کە سەلامەتیی ئەندامانی جەستە بە تەواوەتی مافێکی پارێزراوە، چونکە لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ ئەرک و کارەکانی لە ڕێگەی تەواوی و سەلامەتیی ئەندامەکانی جەستەیەوە ئەنجام بدات، ئەمەیش پێی دەگوترێت "مافی مرۆڤ لە تەواویی جەستە".

بۆ نموونە یاسای ئوردوون لە ماددەکانی (333 – 335)دا چارەسەری بابەتی سەلامەتیی جەستەی مرۆڤی کردوە و پارێزگاریی سزایی سەپاندوە بۆ سەلامەتیی جەستەی مرۆڤ و ئازاردانی کەسەکانی قەدەغە کردوە و ئەو کەسانەش بە کاری قورسی بە شێوەی کاتی سزا داوە بۆ ماوەیەکە کە لە 10 ساڵ زیاتر نییە ئەگەر هەر کارێک ببێتە هۆی بڕین یان لێکردنەوە یان دەرهێنانی یەکێک لە ئەندامەکان، یان ئەگەر ئەو کارە ببێتە هۆی پەکخستنی ئەندامەکە یان لەکارکەوتنی یەکێک لە هەستەوەرەکانی مرۆڤ،

یان ئەگەر ببێتە هۆی دروستبوونی شێواندنی بەرچاو یان هەر جۆرە پەککەوتنێکی هەمیشەیی لە جەستەی مرۆڤ (ماددەی 335/ق.ع).

یاسای سزادانی کوێتی ژمارە (16)ی ساڵی 1960، لە چوارچێوەی ماددەکانی (149 تا 165) هەر جۆرە دەستدرێژییەکی بۆ سەر مرۆڤ و سەلامەتیی جەستەی بە تاوان داناوە، هەروەها لە ماددەی (10)ی یاسای ژمارە (55)ی ساڵی 1978 سەبارەت بە بابەتی چاندنی ئەندامانی جەستە هەمان سزای داناوە بۆ کەسانی تاوانبار بە گریمانەی سەپاندنی سزا بە سەر ئەوانەی پێچەوانەی سیستمی ئەو یاسایانە کار دەکەن، کە وەک یەک پارێزگاری لە سەلامەتیی جەستەی مرۆڤ دەکەن.

بنەماکانی شەریعەتی ئایینی ئیسلام دژی هەر جۆرە کار و کردەوەیەکە، کە ببێتە هۆی لەکەدارکردن و سووکایەتیکردن بە شکۆ و کەرامەتی مرۆڤ یان لە بەهای ئادەمیزادی و مرۆڤایەتی کەم بکاتەوە، چونکە خودا مرۆڤی بە چاکترین شێوە دروست کردوە و بە سەر هەموو بوونەوەرەکانی تردا زاڵی کردوە و

ڕێزی لێ نراوە، وەک خودا لە (ئایەتی 4 ی سورەتی التین)دا دەفەرموێت "لقد خلقنا الانسان فی احسن تقویم).

لە سایەی زیادبوونی خواست لە سەر ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و کەمبوونەوەی ژمارەی بەخشەران، بازرگانیکردن بەو ئەندامانەوە بوەتە بازرگانییەکی بە ڕەواج لە چوارچێوەی تاوانی ڕێکخراودا، چونکە داهات و قازانجێکی بێشوومار لێوە دەست دەکەوێت. ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی ئاماژە دەکەن بۆ کۆی گشتیی ئەو ئەندامانەی جەستەی مرۆڤ، کە لە ساڵی 2009 لە سەر ئاستی جیهان بۆ کەسانی نەخۆش چێنراون، بەڵام هێشتا ڕێژەی 10%ی کۆی پێویستییە پێشبینیکراوەکانی دابین نەکردوە، ئەمەیش لە بەرانبەردا بازاڕێکی بە ڕەواج و گەرمیی کڕین و فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دروست بێت، لە ڕێگەی بەکارهێنانی کەسانی هەژار و کەمدەرامەت بە نهێنی و ئاشکرا بۆ پەرەپێدانی ئەم بازرگانییە نایاساییە.

بۆ نموونە ماددە (3/ب) لە یاسای ئوردوون بۆ ڕێگریکردن لە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە چوارچێوەی چەند دیمەنێکی تردا هێما بۆ پاراستنی سزایی لەم تاوانە دەکات و تێیدا هاتوە: "وشەی ئیستیغلال واتا بەکارهێنانی کەسەکان بۆ کاری سۆخرە یان بەکۆیلەکردن و کارکردنی بە زۆر یان بە مەبەستی دەرهێنانی ئەندامانی جەستە"، بەمەیش یاسای ئوردوونی هاوڕایە لەگەڵ ناوەرۆکی پۆتۆکۆلی نێودەوڵەتی بۆ ڕێگریکردن و نەهێشتنی بازرگانیکردن بە مرۆڤ، کە لە ساڵی 2000دا دەرچوە. هەر لەم چوارچێوەیەدا چەند جۆرێکی تازە لە تاوانی پەیوەست بە بەکارهێنانی خانەکانی مێشک دەرکەوتوە، بۆ نموونە لە ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا، هەر چەندە ڕێگە دراوە بە کۆپیکردنی جیناتەکانی مرۆڤ لە چارەسەری پزیشکیدا، هەروەها ڕێگەدان بە کوشتنی کۆرپەلە لە پێناو ئەنجامدانی توێژینەوە پزیشکییەکان، بە تایبەتی لە کەرتی تایبەتدا. چەندین باند و مافیای تایبەتمەند لە

بەکرێگرتنی کچان و سکپڕکردنیان پەیدا بوو، پاشان سکەکانیان لەبار دەبرێت بۆ ئەوەی خانەو جیناتی کۆرپەلەکان لە نەشتەرگەرییە پزیشکییە جۆراوجۆرەکاندا بە کار بهێنن، وەک خانەکانی مێشک بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیی (پارکنسۆن) و دەرهێنانی پەنکریاس بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیی شەکرە و خانەکانی خوێن بۆ چارەسەرکردنی شێرپەنجەی خوێن و ئەمیمیا و تالاسیمیا و... هتد. لە ڕاستیدا ترس هەیە لە گەشەکردنی ئەم دیاردەیە و تەشەنەکردنی بۆ دەوڵەتانی تر لە پاڵ گەشەسەندنی تاوانی ڕێکخراو بۆ بازرگانیکردن بە مرۆڤ لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجە تاوانکارییەکانیان. هەروەها ترسی زۆر هەیە لە توانای زاناکان لە ڕووی دەستکاریکردنی بیرەوەریی مرۆڤ یان سڕینەوەی بە تەواوەتی، یان گۆڕینی فکر و بیروباوەڕی خەڵک لە دوای ئەنجامدانی نەشتەرگەریی پزیشکی، کە تێیدا کار لە سەر خانەکانی مێشک دەکرێت.

**گریمانەکانی توێژینەوە لە سەر بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ**

1. بەرپرسیارێتیی سزایی لە ئەنجامی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دەکەوێتە ئەستۆی فرۆشیاران، کڕیاران، دەلاڵەکان، بەشداران و پێوەندیداران بە هاتنەدی سێ ڕوکنەکەی تاوان: ڕوکنی ماددی، ڕوکنی مەعنەوی، ڕوکنی شەرعی.

2. تاوانباران لە ئەنجامدانی ئەم تاوانەدا بە پێی یاسای سوودوەرگرتن لە ئەندامانی جەستە بۆ ساڵی 1977 لە دەقێکدا هەموو ئەو کەسانەی بەشداری لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا دەکەن بە تۆمەتبار دەیانداتە قەڵەم.

3. بەرپرسیارێتیی سزایی لە ئەنجامی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە گوێرەی پرۆتۆکۆلی پالێرمۆی تەواوکار بۆ ڕێکەوتننامەی نەتەوە یەکگرتوەکان تایبەت بە بەگژداچوونەوەی تاوانی ڕێکراو لە دەرەوەی سنوری نیشتیمانی بۆ ساڵی 2000 دەکەوێتە ئەستۆی ئەوانەی بەشداریی تێدا دەکەن ئەگەر تاوانەکە لە دەرەوەی سنوری نیشتیمانی و لە ناو زیاتر لە دەوڵەتێکدا ئەنجام بدرێت.

4. یاسادانەری ئوردوونی جەختی کردوە لە سەر زۆرێک ڕێکاری تەشریعی خۆپارێزی لە ناو کۆمەڵێک یاسای سزایی و مەدەنی تایبەت بە بەگژداچوونەوەی ئەم تاوانە و تاوانە هاوشێوەکانی تریش.

5. بەرپرسیارێتیی سزایی دەکەوێتە سەر ئەستۆی بازرگانیکردن بە خانەکانی مێشکی کۆرپەلە لەباربراوەکان لە کاتی هەبوونی هەرسێ ڕوکنەکانی تاوان: ماددی، مەعنەوی و شەرعی.

بەرپرسیارێتیی سزایی لە بەرانبەر تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

بێگومان تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ یەکێکە لەو تاوانانەی، کە پێشێلکارییەکی زەقە لە بەرانبەر هەموو ماناکانی مرۆڤایەتی، لەبەر ئەوەی دەستبردنە بۆ سەلامەتیی جەستە و ئەندامەکانی، کە پێکەوە بە شێوەیەکی تەواوکاری کار دەکات بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە زیندەییەکانی. ئەم تاوانە لە ڕیزی تاوانە هەرە مەترسیدارەکاندا پۆلێن دەکرێت، چونکە سنوری یەک دەوڵەت

دەبەزێنێت بەرەو ڕوانگەی جیهانی، وەک هەمیشەیش کۆمەڵێکی زۆر لە تاوانکاران بەشداری دەکەن لە ئەنجامدانی ئەم تاوانە لە ژێر ناوی جۆراوجۆری وەک: ناوەندگیریکردن، دەلالی، کڕیار و فرۆشیار.

بەگژداچوونەوەی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ پێویستی هەیە بە یەکخستنی هەموو هەوڵ و تەقەللا نێودەوڵەتییەکان بە مەبەستی نەهێشتنی و دارشتنی سیاسەتی تۆکمە لە سەر ئاستی نیشتیمانی و نێودەوڵەتی لە پێناو شوێنکەوتن و لێپێچینەوە لە تاوانباران وەک زەمینەخۆشکردن بۆ ڕاپێچکردنیان بۆ دادگا. لە دوایین دەیەی ئەم سەدەیەدا گرینگیپێدانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی کەوتە سەر زاڵبوون بە سەر ئەو کۆسپ و ئاستەنگانەی، کە تاوانی هاوچەرخ هێناویەتە ئاراوە و سەپاندوویەتی، لەوانەیش تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ. بواری زانستی پزیشکیی سەرکەوتنی گەورەی بە دەست هێناوە لە ڕووی گواستنەوەی هەندێک لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ،

ئەمەیش هیوای لە دڵ و دەروونی زۆرێک لە نەخۆشەکاندا بووژاندەوە و بواری پێدان بۆ چاندنی ئەندامەکان کەسانێکی ساغ لە ناو جەستەی کەسانێکی نەخۆشدا، کە ئەمەیش ڕزگاریان دەکات لە ئازار و وەرگرتنی چارەسەری ماوەدرێژی وەک شتنی گورچیلە، بەڵکوو باشتر پارێزگاری لە ژیانیان دەکات. سەرەڕای ئەوەی کە زۆرێک لە یاساکان و ئەو فەتوایانەی ڕێگە دەدەن بە بەخشین و ڕسپاردەیی بە بەخشینی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، بەڵام ئەمە پێویستییەکان بە تەواوی دابین ناکات، تا ئەندامەکان بگوازرێنەوە و بۆ نەخۆشەکان دابنرێت، نەک بە هۆی نەگونجانی فسیۆلۆژی یان پزیشکی لە نێوان جەستەی کەسی بەخشەر و کەسی نەخۆش (وەرگر) دا، بەڵکوو کێشەکە بە شێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ پاشگەزبوونەوە لە بەخشین و ڕاسپاردن بە بەخشین لەبەر چەند هۆکارێکی کۆمەڵایەتی و تەندروستیی پەیوەست بە کۆمەڵگە و سروشتی مرۆڤەوە.

## بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ وەك هەر تاوانێك

هەر وەک پێشتر باس کرا، پەنابردن بۆ کڕینی ئەندامێکی جەستەی مرۆڤ لەبەر پێویستی زۆری نەخۆشەکانە تا ژیانیان لە مردن ڕزگار بکرێت، لەبەر ئەوە پێویستییەکەی لەوەدایە، کە بە هۆی وەرگرتنی ئەندامی جەستەی مرۆڤێکەوە مرۆڤێکی تر دەتوانێت بژی و لە مردن ڕزگاری ببێت، ئەمە لە کاتێکدایە ئەو کەسانەی دەبەخشن یان ڕاسپاردەیان کردوە بۆ ئەوەی ئەندامەکانی جەستەیان ببەخشرێت ژمارەیان زۆر کەمە. لە

هەمان کاتدا زۆرێک کەس هەن توانای ماددیان باشە و دەتوانن بە هەر نرخێک بێت ئەندمەکانی جەستە بکڕن، هەموو ئەم فاکتەرانەش یارمەتیدەرن لە چالاککردنی جوولەی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بەو خەڵکەی پێویستیان پێیەتی، چونکە پێویستە تێگەیشتن لەم بەخشین و گواستنەوەی ئەندامانەی جەستە بۆ کەسانی تر ئەوە بێت، کە کڕینوفرۆشتنی ئەندامەکان بەرژەوەندیی کڕیار و فرۆشیاری وەکیەک تێدایە، واتە یەکێک دەژی و لە مردن ڕزگاری دەبێت، ئەوەی تریش لە ڕووی داراییەوە سوود وەردەگرێت. لەبەر تازەیی بابەتی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە سەر ئاستی جیهانی و نەبوونی هەڵوێستێکی ڕوون و ڕاشکاوانە لە لایەن یاسا دانراوەکان یان شەریعەتی ئیسلامییەوە، ئەم پرسە لە یاسادانەران و شەرعزانەکان دەخوازێت تا هەوڵ بدەن بیر و ڕا و بۆچوونەکانیان لە سەر بنەما دونیاییەکان بونیاد بنێن، ئەمەیش ناکۆکی و جیاوازی لە بۆچوونەکاندا دروست کردوە سەبارەت بە مەشرووعیەتی ئەم کارە

لە ڕوانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە. هەندێک لە شەرعزانەکانی ئیسلام دەڵێن جائیزە ئەندامی جەستەی مرۆڤ بفرۆشرێت ئەوەیش پاڵپشتە بەو بنەما شەرعییەی، کە دەڵێت ئەو کارە بەرانبەرە بە پاراستنی ژیانی مرۆڤ.

## بازرگانیکردن بە ئەندامی لاشەی مردوەکان

لە پێش قسەکردن دەربارەی مامەڵەکردنە نامەشرووع و نایاساییەکان بە ئەندامانی لاشەی مردوان، لەوانەیش بازرگانیکردن پێیانەوە، پێویستە لە سەرمان چەمکی مردن لە ڕووی پزیشکی و شەرعییەوە دەستنیشان بکەین، جگە لە ڕەگەزە پزیشکی و یاساییە داڕێژراوەکان سەبارەت بەم بابەتە هەستیار و گرینگە. مردن بە مانا سادە و ئاساییەکەی بریتییە لە دەرچوونی ڕوح لە جەستەی مرۆڤ، بە شێوەیەکە هەموو ئاماژەکانی جووڵە و زیندەگی لە لەشی مرۆڤ دەوەستێت، لە ڕووی زانستیشەوە سەلمێنراوە، کە دەکرێت سوود لە هەندێک ئەندامی جەستە وەربگیرێت لە دوای مردن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ،

واتا بەکارهێنانی لە لایەن کەسێکی ترەوە، لە کاتێکدا زۆر پێویستی بە بەکارهێنانی ئەو ئەندامە هەیە تا بتوانێت بژی و نەخۆشییەکەی تێپەڕێنێت.

بە ڕای توێژەران گواستنەوەی ئەندامی جەستەی کەسی مردوو بۆ کەسی زیندوو زیانی کەمترە لە چاو دەرهێنان یان لێکردنەوەی ئەندامێک لە جەستەی مرۆڤێکی زیندوو، لەبەر ئەوەی لە ڕووی کێشەی پزیشکییەوە هیچ ترسێک نییە لە سەر ژیانی کەسی یەکەم کە «مردوە».

یاسا دانراوەکان قەدەغەیان کردوە یاری یان سووکایەتی بە تەرمی مردوانەوە بکرێت، چونکە ئەو تەرمە خاوەنی پارێزگارییەکی تایبەتیە، هەر بۆیە یاسادانەران سزایەکیان داناوە بۆ هەر کەسێک هەڵبستێت بە لەکەدارکردنی پیرۆزیی تەرمی مردوو شوێنەکانی بەخاکسپاردنی مردوان. هەروەها شەریعەتی ئیسلام گرینگی داوە بە پاراستنی تەرمی مرۆڤ لەو کەسانەی دەیانەوێت سووکایەتیی پێ بکەن لە دوای مردنی

مرۆڤەکە. لەم بارەیەشەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەری ئیسلام «د.خ» دەڵێت: کسر عظم المیت ککسره حیا «(ئەبو داود) ڕیوایەتی کردوە.

لە ڕاستیدا دیاریکردنی ساتی گیانلەدەستدان زۆر گرینگە لە پرۆسەی گواستنەوەی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤی مردوو بۆ کەسێکی زیندوو. لە کۆندا دیاریکردنی کاتی گیانلەدەستدان هیچ کێشەیەکی دروست نەدەکرد، لەبەر پشتبەستن بە پێوەرە کلاسیکییەکان لە ڕووی دەستنیشانکردنی کاتی مردن، بۆ نموونە وەک وەستانی دڵ، کە وەستانی کۆئەندامی هەناسەدان و لەدەستدانی هۆش و گۆش و دەرچوونی ئۆکسجینی ناو لەش بە دوایدا دێت، بەڵام بە هۆی داهێنانی ئامێرە پزیشکییە پێشکەوتوەکانەوە، کە خزمەتگوزاریی بووژاندنەوەی دەستکردی بۆ نەخۆشەکان دابین کردوە، بوەتە هۆی ئەوەی نەتوانرێت بە ئاسانی ساتەوەختی گیانلەدەستدانی کەسێک دیاری بکرێت.

**جۆر و شێوازەکانی ئەنجامدانی تاوانی**

**بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ**

لەم ساڵانەی دواییدا چەندین جۆر و شێوازی نوێی تاوان پەیدا بوە، کە خراپی تاوانەکان گەییشتوەتە ئاستی پێشێلکردن و لەکەدارکردنی شکۆ و پیرۆزیی ئادەمیزاد و مرۆڤایەتی بە گشتی، بە شێوەیەک کە چیی تر لێکەوتە و کاریگەرییەکانی پەیوەست نییە بە سنورێکی جوگرافی دیاریکراو یان ئاسمان و زەوی و سنوری وڵاتێک، بەڵکوو سنورەکانی بەزاندوە و بوەتە کارێکی نێودەوڵەتی، بەڵکوو ئەمانە چەند جۆرە تاوانێکن، کە مرۆڤایەتییان گەڕاندوەتەوە بۆ سەردەمی تاریکی و یاسای دارستان لە ڕووی قەبارەی دڕندەیی و خراپییانەوە. دیارترینی ئەم تاوانانە لە سەر ئاستی جیهان، تاوانی بازرگانیکردنە بە مرۆڤ. ئەگەر پرسیار بکەین دەربارەی هۆکارەکانی هەبوونی ئەم تاوانە بەو قەبارە زۆرە، دوای ئەوەی چەندین دەیەی دووروودرێژ بەرۆکی مرۆڤایەتی بەردابوو، ئێستا بۆمان ڕوونە کە بەرژەوەندخوازیی ماددی و چاوتێبڕین لە بەدەستهێنانی قازانجی زۆروزەوەندە، کە ساڵانە ئەم بازرگانییە بۆ باند و گروپەکانی تاوانی

ڕێکخراو لە جیهاندا دەستەبەر دەکات، هۆکاری سەرەکییە بۆ برەوپێدان و گەشەکردنی ئەم بازرگانییە. بە پێی کتێبی «ئەلدوێکات»، کە لە ساڵی 2010دا دەرچووە، تێکڕای قازانجی ساڵانەی باند و مافیا تاوانکارییەکان لە بازرگانیکردن بە مرۆڤ بە 36 ملیار دۆلاری ئەمەریکی مەزەندە دەکرێت. بە هۆی مەترسیی زۆری ئەم تاوانانە لە ڕووی جۆرایەتییەوە، ڕێکخراوە نیشتیمانی و هەرێمی و نێودەوڵەتییەکان گرینگییەکی زۆریان بەم بابەتە داوە و دەست کراوە بە ئەنجامدانی کۆنفراس و واژۆکردنی ڕێکەوتننامە و پەیماننامە بۆ بەگژداچوونەوەی ئەم تاوانە مەترسیدار و نامرۆڤانەیە.

**جۆرەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ**

1. پەلکێشکردن: مەبەست لە پەلکێشکردن بریتییە لە بەکارهێنانی کەسەکان وەک کاڵا بۆ دەستاودەستکردن بۆ زەمینە خۆشکردن لە پێناو کەڵکوەرگرتن لە ئەندامەکانی جەستەیان بە مەبەستی فرۆشتنی و بەدەستهێنانی

قازانج، له کاتێکدا ئەگەر ئەم فرۆشتنه له ناو سنوری هەرێمی یان له دەرەوەیدا ڕوو بدات. له ئەنجامی ئەم پەلکێشکردنەدا وەک هەمیشه دەبینین ئەو کەسەی به کار دەهێنرێت کۆنترۆڵ دەکرێت و ئازاد نییه و لاوازە، ئەمەیش ئاماژەیه بۆ ئەوەی خواستەکانی کەسی بەکارهێنەر بۆ ئەو مەبەستانەی باسمان کرد جێبەجێ دەبێت له بەرانبەر پێدانی بڕێک پارەی کەم. له بنەڕەتدا گرینگی نادرێت به ڕەزامەندیی قوربانییەکه به هۆی ئەوەی که ڕۆڵی ئیرادە له ئاستی جوولاندنی هەڵسوکەوتی تاوانکاریی ناوەستێت، بەڵکوو هەنگاو دەنێت بەرەو بەدیهێنانی ئەنجامەکه، که بریتییه له فرۆشتنی ئەندامێکی جەسته له بەرانبەر دەستکەوتنی ماددی.

2. گواستنەوەی قوربانییەکان: مەبەست لەم پرۆسەیه جوولەپێکردنی کەسەکانه له شوێنێک له ناو سنوری وڵاتێک یان له دەرەوەیدا به مەبەستی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەیان، وەک هەمیشه ئەم کاره به هۆی ڕێگه ئاساییەکانەوه ئەنجام دەدرێت، وەک فرۆکه و ئۆتۆمبیلی گواستنەوە. له ڕاستیدا گواستنەوەی کەسەکان

شێوەی ئاودیوکردن و گواستنەوەی یاساغ لە ڕێگەی سنورەکانەوە ناو دەبرێت ئەگەر بێت و گواستنەوەکە لە نێوان دەوڵەتاندا بێت، ئەمەیش بە گشتی لە ناو بازاڕی بەقاچاغ گواستنەوەی مرۆڤ ئەنجام دەدرێت، بۆ نموونە جووڵەیەکی چالاکیی مرۆڤەکان لە تورکیاوە بەرەو بەریتانیا و لە فلیپین بەرەو ژاپۆن هەیە.

3. حەواندنەوە: مەبەست لە حەواندنەوە دابینکردنی شوێنی هێشتنەوە و نیشتەجێبوونە بۆ قوربانییانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە لایەن بازرگانانان و دەلاڵ و نێوەندگیرەکانەوە، ئەوەیش وەک ڕێگەخۆشکردن بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری بۆیان لە پێناو دەرهێنانی ئەو ئەندامانەیان کە کڕینوفرۆشتنیان پێ دەکرێت، زۆر جاریش لە کاتی مانەوەیاندا لەو شوێنانە کاری لەشفرۆشی و کاری سۆخرە و بەزۆریان پێ دەکرێت.

4. پێشوازیکردن: واتا پێشوازیکردن لە قوربانییانی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و ناسینەوەیان بە مەبەستی ناسینەوەیان و نەهێشتنی کۆسپ

و ئاستەنگەکان لە سەر ڕێگەیان بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی باش نیشانی کڕیارەکانی بدەن، وەک زەمینەخۆشکردن بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی مەبەستە.

## دیمەنەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

أ. هەڕەشەلێکردن: لە ڕاستیدا هەڕەشەلێکردن یەکێکە لەو ڕێگایانەی بە کار دەهێنرێت بۆ دروستکردنی فشار لە سەر قوربانییەکان بۆ ئەوەی فەرمانەکانی بازرگانان و دەلاڵەکان جێبەجێ بکەن، وەک هەمیشەیش هەڕەشەلێکردن زیانی ماددی بە قوربانییەکان دەگەیەنێت بە هۆی لێدان یان ئازاردانیان، یان دروستبوونی زیانێکی مەعنەوی لێ دەکەوێتەوە وەک ناوزڕاندنی قوربانییەکە و لەکەدارکردنی ناوبانگ و شەرەفمەندێتی، لە هەر دوو بارەکەیشدا کەسی قوربانی نایەوێت ئەو کارە بکات ئەگەر هەڕەشەی لە سەر نەبێت.

ب. ڕفاندن: پێوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان تاوانی ڕفاندن و بازرگانیکردن بە ئەندامانی

جەستەی مرۆڤ، چونکە قوربانییانی ڕفێنراو ئەگەری هەیە ببنە کاڵایەک بۆ کڕینوفرۆشتن، بەڵکوو بۆ فرۆشتنی ئەندامانی جەستەیان لە لایەن گرووپە تاوانکارەکانەوە، یان پێدەچێت لەو ڕێگەیەدا بکوژرێن. ڕووداوی لەم جۆرە ڕووی داوە کاتێک خۆپیشاندانی گەورە و بەرفراوان لە دەیەی حەفتاکانی ڕابردوو پایتەختی بەرازیلی گرتەوە وەک نارەزاییەک لە دژی ڕفاندنی 6 مێردمنداڵ و کوشتنیان و دەرهێنانی ئەندامەکانی جەستەیان لە لایەن باند و مافیا تاوانکارەکانەوە، کە پێوەندیی گوماناوییان لەگەڵ دەزگاکانی هەواڵگری ئەو وڵاتە هەبوو.

ج. پێدانی جۆرێک لە تایبەتمەندێتی بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی کەسی قوربانی یان دەستدرێژی کراوەسەر، ئەم کارەش فرت و فێڵی لە پاڵدایە، وەک ڕازیکردنی بە ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکی پێویست، بەڵام دوایی لەشی تووشی ئازار و کێشە دەبێت و لە پشکنینەکاندا دەردەکەوێت، کە بوەتە قوربانی تاوانی دەرهێنانی ئەندامانی جەستە. هەروەها لەم ڕێگەیەوە لەوانەیە قوربانیەکە هەڵبخەڵەتێنرێت

بە پێدانی دەرفەتی کار لە شوێنێک، یان بەڵێندان بە هەبوونی پرۆژەیەکی درۆ بە مەبەستی گواستنەوەی لەو شوێنەی لێی دەژی بۆ ئەو شوێنەی، کە تاوانکاران بە شێوەیەکی بێویژدانانە بێهۆشی دەکەن و یەکێک لە ئەندامانی جەستەی دەردەهێنن.

د. ئەگەر بە ڕەزامەندیی قوربانییەکانیش بێت، یاساکان ڕێگەیان نەداوە بە کەسانی خوار تەمەن 18 ساڵ تا ئەندامانی جەستەیان دەربهێنرێت بە مەبەستی بەخشین یان فرۆشتن، ئەوەیش بە مەبەستی پاراستنی ژیانیان لە هەر هەڕەشە و مەترسییەک.

## ڕێگە و میکانیزمەکانی ئەنجامدانی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

مەبەست لە میکانیزمەکان، هەموو ئەو ڕێگە و شێوازانەیە کە دەگیرێنەبەر بۆ ئەنجامدانی تاوانی دەرهێنانی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ بە مەبەستی فرۆشتنیان، ئەگەر بە گرتنەبەری شێواز و ڕێگە زانستی و هونەرییەکان بێت، یان گرتنە بەر و بەکارهێنانی ئەو ڕێگایانەی کە پێچەوانەن لەگەڵ بنەما پزیشکییە زانستییەکان. دەکرێت کۆی ئەم ڕێگە و میکانیزمانە لەم خاڵانەدا کۆ بکەینەوە:

أ. نەشتەرگەرییە زانستییەکان: نەشتەرگەرییەکانی دەرهێنانی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە ناو نەخۆشخانەکان یان نۆرینگە پزیشکییەکاندا ئەنجام دەدرێت، ئەوەیش لە دوای گەییشتن بە ڕێکەوتن لە نێوان کەسی بەخشەر و کەسی وەرگردا، زۆربەی نەشتەرگەرییە پزیشکییەکانیش بەو شێوەیە ئەنجام دەدرێت کاتێک هەردوولا لە هەمان نەخۆشخانە بن، ئەوەیش بە مەبەستی پارێزگاریکردن لە کوالیتیی ئەو ئەندامەی جەستە کە دەردەهێنرێت. ئەگەر بێتو پرۆسەی گواستنەوەی ئەندامەکە بە ڕێگەیەکی نایاسایی بکرێت، ئەوا بەرپرسیارێتیی سزایی یاسایی دەکەوێتە ئەستۆی پزیشک و نەخۆشخانەکە، چونکە دوور نییە دەرهێنانی ئەندامێکی جەستە ببێتە هۆی مردن یان دروستبوونی کەموکورتییەکی هەمیشەیی، لێپرسراوێتیەکەیش بە پێی ئەنجامە نەرێنییەکانی ئەو تاوانە دەبێت.

ب. دزینی ئەندامی جەستەی مرۆڤ: هەندێک جار لەوانەیە کەسێک بە نهێنی بڕفێنرێت بۆ نەخۆشخانەیەک، بەڵام ڕفێنەرانی تووشی

شۆک دەبن کاتێک دەبینن یەکێک لە ئەندامەکانی جەستەی لە دەست داوە. لە نموونەی ئەم حاڵەتە لە وڵاتی ڤێنزوێلا ڕووی داوە کاتێک پیلاوێک بە ناوی فرویلان گێمینز لە لادێوە هاتبوو بۆ شار تا تێیدا بژی، بەڵام بە هۆی خراپی باری دارایی و ئالوودەبوونی لە سەر خواردنەوە کهولییەکان، ڕۆژێکیان کاتێک بەخەبەر هات بۆی دەرکەوت، کە هەر دوو چاوی نەماوە، چونکە چاوەکانی فرۆشرابوون بە کەسێکی دەوڵەمەند، کە پێویستبوو ئەو چاوانەی گێمینزی بۆ بچێنرێت، بەڵام دوای ئەوەی کار لەکار ترازا پیاوانی لێکۆڵینەوەی تاوانەکان تاوانبارەکانیان دۆزییەوە.

### ئامانجە سەرەکییەکانی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

ڕەوایەتیی مەبەست یان ئامانج بە هیچ شێوەیەک نابێتە پاساوهێنانەوە بۆ شەرعیەتپێدان بە ئامرازەکانی تاوانێک وەک دەرهێنان و فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، چونکە ئاشکرایە کە گەشەکردنی ئەم جۆرە لە تاوان لە ئەنجامی بەیەککەیشتنی پێویستی و

بەرژەوەندیی جۆراوجۆرەوە سەری هەڵداوە، هەر چەندە دەستبەرداربوون لەم بەرژەوەندییانە بە پێی ئارەزووەکانی مرۆڤ و بە بێ کارێکی ڕێکخراو ئەنجامی مەترسیداری لێ دەکەوێتەوە، لەبەر ئەوە یاسادانەران لەم بابەتەدا کاریان کردوە بۆ ڕێکخستنی پرۆسەی بەخشینی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و دانانی چەند سزایەکی توند بە سەر هەموو ئەو کەسانەدا، کە پێویستیی هەندێک مرۆڤ بە کار دەهێنن بۆ ئەوەی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بکەنە کاڵایەک بۆ کڕینوفرۆشتن، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی فرۆشتنی ئەندامەکان بە ئامانجی بەدەستهێنانی قازانجی ماددی، لەمەیش گرینگتر ئەوەیە، کە ئەم کارە لە بەهاو شکۆمەندی مرۆڤەکان کەم دەکاتەوە.

دەکرێت کۆی ئامانج و مەبەستەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لەم خاڵانەدا کورت بکەینەوە:

1. خواستنی گەیشتن بە چاکبوونەوە و گەڕانەوەی هیوا بۆ ئەو نەخۆشانەی تووشی ئەو جۆرە نەخۆشییانە بوو، کە پێویست دەکات بە زوویی چارەسەری پزیشکییان بۆ بکرێت و

یەکێک لە ئەندامەکانی جەستەیان دەربهێنرێت و ئەندامێکی تریان بۆ دابنرێت، بۆ نموونە وەک گورچیلە، بەشێک لە جگەر و شادەمارەکانی دڵ. پێویستی نەخۆشە بێ هیواکان بەم ئەندامانەی جەستە وایان لێ دەکات، کە پارەیەکی زۆر بدەن لە پێناو بەدەستهێنانی ئەو ئەندامەی کە پێویست دەکات بۆی دابنرێت.

2. بەدەستهێنانی قازانجی دارایی زۆر لە ڕێگەی نێوەندگیریکردن لە نێوان کەسی بەخشەر و کەسی وەرگر، وەک هەمیشە دەلاڵ و نێوەندگیرەکان هەڵدەستن بە بەدەستهێنانی ئەم بڕە پارانە و بڕێکی کەمی دەدەنە بەخشەرەکان، لە کاتێکدا کەڵک لە هەژاری و نەدارییان وەردەگرن.

3. هەبوونی خواست لە لای کەسانی بەخشەر بۆ چارەسەرکردنی هەندێک لە کێشە ئابوورییەکانیان و کۆکردنەوەی پارەیەک ئەگەر کەمیش بێت، ئەمەیش بە مەبەستی پێدانەوەی قەرزەکان یان باشترکردنی ڕەوشی ژیانیان لە سەر حسابی تەندروستیتان و بەرگەگرتنی ئەو مەترسییە تەندروستییانەی کە هەڕەشە لە ژیانیان دەکات.

4. خواستی زانکۆکان و کۆلیژە پزیشکییەکان و کۆمپانیاکانی دروستکردنی دەرمان لە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی پزیشکی زانستی، لەبەر ئەمە ئەو دامودەزگایانە پێویستیان بە بەدەستهێنانی ئەندامانی جەستەی کەسانی زیندوو هەیە. بە پێی توێژەران هەموو ئامانجەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ئامانجی تاوانکاری و نامەشرووعن و ناتوانن بەرگی یاسایی بکەن بە بەری تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە و هەرگیز لەگەڵ یاسادا ناگونجێت، چونکە پەیوەستە بە بوونی بەرانبەرێکی ماددییەوە، بەڵام فاکتەری بەزەیی و خۆبەخشین بە وابەستەیی خزمایەتی و کەسوکار و مرۆڤایەتی، بەڵام بە بێ زیانگەیاندن بە جەستەی کەسی بەخشەر لەگەڵ حوکمی یاسادا دەگونجێت.

## بنەما گشتییەکانی تاوانی بازرگانیکردن
## بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

### پێشەکی

بەو پێیەی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ واقیعێکی یاساییە و سروشتێکی تێکەڵاوی هەیە، بۆیە بنەمایەکی ماددی و بنەمایەکی مەعنەوییشە. لایەنە ماددییەکەی لە مامەڵە و ڕەفتارەکانی کەسانی تاوانبار و لێکەوتەکانی خۆی دەبینێتەوە، بەڵام لایەنی مەعنەویی پەیوەستە بە ویست و زانینی کەسانی تاوانکار بەوەی ئەم کارەی ئەنجامی دەدەن کارێکی هەڵەیە بە مانا گشتییەکەی،

بەو شێوەیەی یاسا باسی لێوە دەکات بۆ دروستبوونی بنەمای مەعنەوی، جگە لەمەیش تاوانەکە دەستکردنی مرۆڤە، بۆیە پێویست دەکات پاڵنەری ئەنجامدانی تاوانەکە هەر خواستی مرۆڤ بێت.

لە ڕاستیدا بنەمایەکی تریش هەیە، کە سیفەتی یاساییبوون لەم کار و تاوانە دادەماڵێت، کە تاوانکاران بۆ بەدەستهێنانی پارە ئەنجامی دەدەن. لەبەر ئەمە بە گوێرەی هەموو یاسا و ڕێسا سزاییەکان ناکرێت قسە لە سەر تاوانێک بکرێت، کە لە دەقی یاساکاندا نەهاتبێت، سەرەڕای ئەمەیش تاوانەکە بە دوو پاڵپشت ئەنجام دەدرێت: پاڵپشتی ماددی و پاڵپشتی مەعنەوی، لە کاتێکدا تاوانەکە کاری کەسی تاوانکار و بە ویستی ئەو دەکرێت، بۆیە لە ڕوانگەی سزاییەوە لە سەر بنەمای ئەم دوو پاڵپشتە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت.

بنەمای ماددی لە ماتریاڵەکانی ئەو تاوانەدا خۆ دەبینێتەوە، کە لە جیهانی دەرەوەی تاوانەکەدا بەدەردەکەوێت و سێ سەرچاوە بەشدارن لە پێکهێنانی ئەم بنەمایەدا، ئەوانیش بریتین

لە: کردار، ئەنجام، پێوەندیی هۆکاریی. کردار بریتییە لە هەڵسوکەوتی ئەرێنی یان هەڵوێستی نەرێنی، کە پەیوەستە بە کەسی تاوانبارەوە، ئەنجامیش بریتییە لەو کاریگەرێتییە دەرەکییەی کە دەستدرێژیکردن بۆ سەر مافی پارێزراو بە یاسا بەرجەستە دەکات، بەڵام هەرچی پێوەندیی هۆکارییە بریتییە لەو پەیوەندییەی، کە ئەنجام و کردار بە شێوەیەکی ئەرێنی یان نەرێنی پێکەوە دەبەستێتەوە. بنەمای مەعنەوی خۆی دەبینێتەوە لەو خواستەی، کە کرداری لێوە دەردەچێت و لە شێوەی مەبەست لە تاوانێکی ئەنقەستی تێدا بەرجەستە دەبێت، یان لە شێوەی هەڵەیەکدا دەبێت، کە دەبێتە هۆی تاوانێکی نائەنقەست.

لە ڕێگەی چەسپاندنی ئەو حوکمانەی پێشتر باس کرا بە سەر تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم جۆرە تاوانەیش وەک هەر تاوانێکی تر بنەمای ماددی و مەعنەوی و شەرعییشی هەیە، هەر چەندە کتێب و نووسینە شەرعییەکان لێکدانەوەی جیاوازیان هەیە لە ڕووی دیاریکردن و وەسفکردنی دەرهێنان و چاندنی ئەندامی

جەستەی مرۆڤ لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر، لە پاڵ ئەو کێشانەی لێی دەکەوێتەوە بە هۆی نیازی بەخشین یان فرۆشتن، هەروەها بە هۆی فرەیی ئەو سەرچاوانەی، کە ئەم کردەوەیە بە تاوان دەدەنە قەڵەم لە ڕوانگەی یاساکانی سزادان و یاساکانی بەخشینی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و یاساکانی تایبەت بە ڕێگرتن لە بازرگانیکردن بە مرۆڤ.

ئەم دەقە یاساییانەی، کە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە تاوان و تاوانکاری دادەنێن تازە نین، بەڵکوو لە دوای زۆربوون و گەورەبوونی ئەم دیاردە تاوانکارییە و فەراوانبوونی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە لایەن دەوڵەتانەوە داڕێژراون. توێژینەوەیەک کە لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی ئەنجام دراوە ئاماژە بەوە دەکات، کە تەنها لە ساڵی 2005دا (66000) نەشتەرگەریی چاندنی گورچیلە لە سەر ئاستی جیهان کراوە، ڕێژەی بەخشەران بە بێ وەرگرتنی بەرانبەر تەنها 10% بوە، بەڵام 90%ی بەخشەرانی ئەندامی

گورچیله بەو نەخۆشانەی پێویستیان پێی هەبوە و لە ڕێگەی بازرگانیکردنی نایاسایی بەو ئەندامانەوە دەستیان کەوتوە پارەیان وەرگرتوە، بۆیە یاساکان دارێژراون بۆ ئەوەی ڕێگە لە گەورەبوونی ئەم تاوانە بگیرێت و سزای توندیشی بۆ بازرگانان و تاوانبارانی تێوەگلاو لە ئەنجامدانی ئەم تاوانە داناوە.

**بەرپرسیارێتیی پزیشکان و فرۆشیاران و کڕیاران و بازرگانانی ئەم بازرگانیکردنە**

زۆرێک لە یاسا و ڕێسا نیشتیمانییەکان لە چوارچێوەی ڕێکخستنی پرۆسەی گواستنەوە و چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ڕاسپاردە و ڕێنماییان دەرکردوە لە سەر بنەمای دەستبەرداربوون یان بەخشینی ئەندامەکانی جەستە بە خۆڕایی (بێبەرانبەری ماددی) و لە ڕێگەی وەسیەتکردن یان بەخشینەوە، بەڵام بە مەرجێک زیان بە تەندروستیی کەسی بەخشەر یان وەسیەتکار نەگەیەنێت و پێویستە لە سنور و چوارچێوەی بنەما پزیشکییە دیاریکراوەکاندا بێت بە گوێرەی یاسا. بە هۆی ئەوەی کە ئەم

تاوانە بە نێودەوڵەتی بوە و سنوری یەک دەوڵەت دەبڕێت بەرەو دەوڵەتانی تر، بۆیە پێشبینی هەبوونی بازرگان و دەلاڵەکان دەکرێت، کە هەڵدەستن بە گواستنەوەی قوربانییەکان لە نێوان دەوڵەتاندا تا دەیانگەیەننە شوێنی مەبەست و لە دەوڵەتێکی تردا نێوەندگیری لە نێوان کڕیار و فرۆشیاردا دەکەن.

هەموو یاسا دانراوەکان و شەریعەتی ئایینی ئیسلام لەسەر ئەوە کۆکن، کە پێویستە پارێزگاری لە تەواوی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ بکرێت و سزای ئەو کەسانەیش بدرێت کە بە نیازی خراپ دەستی بۆ دەبەن بە مەبەستی شێواندنی یان دەرهێنانی پێکهاتە ئۆرگانییەکانی، ئەم سزایەیش بە گوێرەی ئەو زیان و کاریگەرییانەی دیاری دەکرێت، کە بەر ئەرک و پیشە ژیارییەکانی ئەندامەکانی تری هەمان جەستە دەکەوێت، کە یەکێک لە ئەندامەکانی دەردەهێنرێت. لە ڕوانگەی ئەم پارێزگاریکردنەوە ئەو یاسا بەرکارانە جێبەجێ دەکرێت، کە پرۆسەکانی دەرهێنان و چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ڕێک دەخەن و بوونەتە بناغەیەک بۆ پاراستنی سەلامەتیی

ژیان و جەستەی کەسی بەخشەر، بە جۆرێک کە کاریگەریی نەبێت بۆ سەر ژیانی. هەروەها بە شێوەیەکی ڕەها ڕێگەی گرتوە کە بەخشینی ئەندامی جەستە لە بەرانبەر وەرگرتنی پارەدا بێت، ئەوەیش لە ڕوانگەی بنەمای ڕێزگرتن لە پیرۆزی جەستەی مرۆڤ و تەماشانەکردنی وەک کاڵایەک بۆ کڕینوفرۆشتن.

وەک هەر تاوانێکی تر، تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤیش ڕوکنی ماددی هەیە، کە لە دەستدرێژیکردنە سەر سەلامەتیی جەستەی نەخۆش و دەرهێنانی ئەندامەکانی خۆی دەبینێتەوە، وەک زەمینە خۆشکردن بۆ گواستنەوەی و فرۆشتنی بە کڕیارەکە لە بەرانبەر بڕێک پارە. بەرپرسیارێتیی هەموو ئەوانەی کە بەرشداری دەکەن لە ئەنجامدانی ئەو تاوانەدا کاتێک پێک دێت، کە مەبەست یان ویستی تاوانکاریی دروست ببێت بە پێی ناوەرۆکی یاساکانی ڕێکخستنی بابەتی کەڵکوەرگرتن لە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و یاساکانی سزادان بە شێوەیەکی گشتی.

هەر یەکێک لەو کەسانەی کە پێچەوانەی بنەماکانی ئەم یاسایانە هەڵسوکەوت دەکەن یان سەرپێچی دەکەن بەرپرسیارێتیی سزایی (جزائی) دەکەوێتە ئەستۆیان وەک پزیشک، بەخشەری ئەندامی جەستە، ئەو کەسەیش کە وەری دەگرێت و کەسی نێوەندکاریش، لەگەڵ هەموو ئـەوانـەدا کە بە شێوەیەکی سەرەکی یان پاشکۆیی بەشدارییان لەو تاوانەدا کردوە، هەر یەکە و بە پێی ئەو ئەنجامە تاوانکارییەی، کە لە ئەنجامی دەرهێنان یان چاندنی ئەندامی جەستە دروست دەبێت، هەروەها ڕێکارەکانی لێکۆڵینەوە و دادگاییکردن لەم تاوانەدا ملکەچ دەبێت بۆ ئەو حوکمە گشتییانەی، کە لە یاسای بنەماکانی دادگاییکردنە تاوانکارییەکاندا هاتوە.

**دەرئەنجامەکان**

1. تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامی جەستەی مرۆڤ یەکێکە لەو تاوانانەی، کە بە پێشێلکاریی مافەکانی مرۆڤ دادەنرێت، کە لە ڕێکەوتننامە و بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکاندا بڕیاری لێ دراوە، هـەر وەک بە دەستدرێژییەکی دیـار و زەق

دادەنرێت بۆ سەر مافی ژیان و سەلامەتیی لاشەی مرۆڤ، کە یاسا سزاییيە بەرکارەکان پارێزگاریی لێ دەکەن، کە بە پێی بنەماکان لە پرۆسەکە لە لێکۆڵینەوەدا پابەندە بە بنەما گشتییەکان و پشکنین و کۆکردنەوەی بەڵگە و دۆکیۆمێنتەکانی پەیوەست بەم جۆرە تاوانانە.

2. پێوەندیی زۆر هەیە لە نێوان تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ و تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، چونکە دەرهێنانی ئەندامی جەستەی مرۆڤ یەکێکە لە ئامانجەکانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ لە سەر ئاستی جیهان، هەروەک هۆکارێکیشە بۆ توندکردنی ئەو سزایەی کە بە پێی یاسا بۆ بەشدارەکانی ئەنجامدانی ئەم تاوانە دانراوە.

3. بەخشینی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ بە گوێرەی شەرع و یاسا ڕێگە پێ دراوە، بەڵام بە مەرجێک لە چوارچێوەی ئەو بنەما یاساییيانە بێت، کە لە یاساکانی ڕێکخستنی بابەتی بەخشینی ئەندامی جەستەی مرۆڤدا ئاماژەیان پێ کراوە و بە مەرجێکیش لە بەرانبەر وەرگرتنی بڕێک پارەدا نەبێت.

4. تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ یەکێکە لە تاوانە نێودەوڵەتییە سنوربڕەکان و تایبەتمەندییەکی هەیە بە هۆی زۆریی کەسە بەشداربوەکانی لە پزیشکان، فرۆشیاران، کڕیاران ودەلاڵ و نێوەندکارەکان، بۆیە کۆنترۆڵکردنی ئەم کردارە تاوانکارییە پێویستی بە هەوڵ و تەقەللای نێودەوڵەتی و کاری پێکەوەیی هەیە لە پێناو بەرەنگاربوونەوە و سنوردارکردنی ئەم دیاردەیە. لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، کە بە هۆی پێویستیی زۆری هەندێک کەس، خواست لە سەر بەدەستهێنانی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ زیادی کردوە، لەو ڕوانگەیەوە کە کەسانێک هەن دەیانەوێت ئەندامی جەستەی خۆیان بفرۆشن، بە تایبەتی گورچیلەیان، ئەوەیش بە هۆی قورسی بارودۆخی ئابوورییەوەیە.

5. پێوەری سەرەکی بۆ دیاریکردنی ساتی مردن بۆ مەبەستی سوودوەرگرتن لە ئەندامەکانی لەشی مردوەکە، بریتییە لە مردنی خانەکانی مێشک، بۆیە لە هەموو بارێکدا پێویستە بڕیاری

کۆچکردنەکە لە لایەن لیژنەیەکی پزیشکییەوە دەربچێت، کە لە ژمارەیەک پزیشکی پسپۆڕ و تایبەتمەند پێکدێت.

6. دەستدرێژیکردنە سەر لاشەی کەسێکی مردوو لە ڕێگەی دەرهێنانی ئەندامێکی جەستەی و فرۆشتنی، بە پێشێلکردنی پیرۆزیی مردوەکان دەدرێتە قەڵەم، ئەوەیش بە پێی یاساکانی سزادان، بۆ نموونە لە هەر یەک لە شانشینی ئوردوون و کویت، بەڵام لە یاسای سزادانی میسریدا بە کارێکی تاوانکاریی دەنانرێت.

7. دەرهێنانی ئەندامی جەستەی مرۆڤ لە حاڵەتی ڕازینەبوونی نەخۆش بە تاوانی دزی نادرێتە قەڵەم، لەبەر ئەوەی کە ئەندامی مرۆیی و تەواوی ئەندامەکانی تری لەشی مرۆڤ نابێتە کاڵایەک بۆ فرۆشتن و مامەڵەپێوەکردن.

### بە یاساییکردنی ئەم بازرگانییە

ئێران تاکە دەوڵەتە، کە ڕێگەی داوە بە کڕینوفرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە ڕێگە و شێوەی یاسایی، بەڵام سەرەڕای ئەمەیش، ئێران چەند کۆتوبەندێکی ئەم جۆرە

بازرگانییە داناوە لە هەوڵێکیدا بۆ سنوردانان لە بەردەم چاندنی ئەندامانی جەستە بۆ گەشتیارانی بیانی. نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامەکان تەنها بۆ هاوڵاتییانی ئێرانی ئەنجام دەدرێت، واتە ڕێگە بە بیانییەکان نادرێت ئەندامەکانی جەستەی هاوڵاتییانی ئێرانی بکڕن. ئەم سیستمە تا ئاستێکی زۆر خێرخوازییە، چونکە لە سەر بنەمای بەخشین دروست بوە و بەخشەرەکان لە ڕێگەی بەخشینی هەر یەکێک لە ئەندامەکانی جەستە هیچ بەرانبەرێکی ماددی وەرناگرن، نەخۆشەکانیش هیچ بڕە پارەیەک نادەن.

لایەنگرانی بەیاساییکردنی بازرگانی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ستاییشی ئەم شێوازە مامەڵەکردنەی ئێران دەکەن، کە لەگەڵ بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤدا دەیکات، بەو پێیەی کە سەلامەت و کاریگەرە. لە گۆڤاری کۆمەڵەی ئەمەریکی بۆ نەخۆشییەکانی گورچیلە وتارێک بڵاو کراوەتەوە، باسی ئەوە دەکات کە ئەم

شێوازەی ئێران هۆکارێکە بۆ ڕوونەدان یان کەمبوونەوەی چەندین کێشەی پەیوەست بە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ. هەر لەو وتارەدا هاتوە: ئەم هەوڵ و تەقەللایانەی لە ناو وڵاتەکانی تردا دەدرێت شکستی هێناوە، تەنانەت لە کەمکردنەوەی زیادبوونی بەردەوامی ژمارەی ئەوانەی ناویان لە لیستی چاوەڕوانی چاندنی ئەندامانی جەستەدا تۆمار کراوە.

هەر یەکە لە ئوستورالیا و سەنگافورە بەمدوایيانە واژۆیان لە سەر یاسای «قەرەبووکردنەوەی کاش»ی ئەو کەسانە کردوە، کە ئەندامانی جەستەیان بە کەسانی تر دەبەخشن. هەموو نەتەوەکانی تر یاسایان دەرکردوە بە ئامانجی ڕێگرتن لە بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە بازاڕی ڕەش، ئەگەر لە ڕێگەی قەدەغەکردنی ڕاشکاوانەوە بێت یان لە ڕێگەی دەرکردنی ئەو یاسایانەی کە وردبینی و پشکنین لە ناسنامەی بەخشەرەکان و سوودمەندان و ئەو شێوازەیشدا دەکەن، کە پرۆسەی چاندنی ئەندامانی جەستەی

پێ کراوە. ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتانی جیهان کاریان لە سەر سیستمێک کردوە، کە گریمانەی دەربڕینی ڕەزامەندیی دەکات لە سەر زیادکردنی ڕێژەی ئەو ئەندامانەی جەستەی مرۆڤ، کە بە شێوەیەکی یاسایی لەبەردەستدان بۆ چاندنیان لە جەستەی نەخۆشەکاندا.

یاسای فیدراڵی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤی قەدەغە کردوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا حکوومەت چەندین پێشنیار و دەستپێشخەری کردوە بە مەبەستی هاندانی بابەتی بەخشینی ئەندامەکان و قەرەبووکردنەوەی ئەو کەسانەی کە ئەندامەکانیان بە کەسانی تر دەبەخشن. لە ساڵی 2004دا ویلایەتی ویستکۆنسن لە ئەمەریکا دەستپێشخەریی کرد بۆ کەمکرنەوەی باجەکان لە سەر ئەو بەخشەرانەی، کە هێشتا لە ژیاندا ماون، بەڵام سەرەڕای ئەمەیش ئاراستەی ئێستا لە سەرتاسەری جیهاندا هەوڵ دەدات بۆ ڕێکخستنی پرۆسەی کڕینوفرۆشتن و دەستکەوتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ.

**نرخەکانی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ**

لە بازاڕە بەیاساییکراوەکانی ئێران نرخی گورچیلەیەک لە نێوان 2000 تا 4000 دۆلاردایە، بەڵام لە بازاڕی ڕەش نرخەکەی دەگاتە ئاستی 160000 دۆلار و پرۆسەی فرۆشتنەکە لە ڕێگەی نێوەندگیرەکانەوە ئەنجام دەدرێت. کاتێک ئەو کارە لە ڕێگەی بازاڕی ڕەشی سەر بە پیشکەشکارانی خزمەتگوزارییە پزیشکییەکان دەکرێت، لەوانەیە ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکی مەترسیدار بێت لە سەر لایەنە بەخشەر و وەرگرەکان (سوودمەندان)، چونکە هەندێک کات کەسی وەرگر (نەخۆش) تووشی هەوکردنی جگەر و دابەزینی ئاستی بەرگریی لەش دەبێتەوە. پێدەچێت ئەو نرخەی دەدرێت بە لایەنە بەخشەرەکان لە بازاڕی ڕەش بگاتە نزیکەی 500 دۆلار، بەڵام لەوانەیە هەندێک لە لایەنە بەخشەرەکان لەوانەیە بڕیکی کەمتر لە 1000 دۆلار وەربگرن. لە پاکستان، گەشتکردن و خەرجی و تێچوونەکانی نەخۆشخانە دەگاتە نزیکەی 500، بەڵام لەوانەیە سەرەڕای ڕێکەوتنیان لە سەر نرخەکەی لە دوای چاندنی گورچیلەکە لە بازاڕی ڕەشدا لێی کەم بکرێتەوە تا ئاستی کەمتر لە 1000 دۆلار.

**فاکتەرەکانی بەیاساییکردنی ئەم بازرگانییە**

1. پاراستنی سەلامەتی

لە ساڵی 1970 ئەو دەرمانانە بەرهەم هێنرا، کە ڕێگرن لە لەدەستچوونی ئەندامی جەستە، بەڵام لە سایەی نەبوونی سیستمە پزیشکییەکاندا، بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە بازاڕی ڕەش گەشەی کرد. ئەو ئەندامانەی کەسانی زیندوو کە دەبەخشرێت بریتین لە: گورچیلە، جگە، گلێنەی چاو، چاندنی سییەکان. زۆربەی بازرگانی بە ئەندامانی جەستە لە چاندنی گورچیلەکان یان جگەر چڕ بوەتەوە. لە ساڵی 2014دا، ڕۆبەرت دالترۆگ لە سەنتەری ئاکاریی زانستی زیندەزانی لە کۆلێژی پزیشکیی زانکۆی هارڤارد «بەشی تەندروستیی جیهانی و پزیشکی کۆمەڵایەتی»، نامەیەکی کراوەی بۆ باراک ئۆباما سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا و سەرکردەکانی تری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا نووسی بە مەبەستی پشتیوانیکردنی پرۆژە ئەزموونییەکانی توێژینەوە لە سەر شێوازەکانی قەرەبووکردنەوەی بەخشەرانی گورچیلە. ژمارەیەک لەو کەسانەی لە بواری

تەندروستی و پیشەگەران لە بواری چاندنی ئەندامەکاندا کاریان دەکرد، هەروەها کەسە ئاکارییەکان، پارێزەران، پیاوانی ئایینی، ئەکادیمیستەکان و کەسانی تریش لە لایەنگرانی ئەو پرۆژە پێشنیارە بەشدارییان کرد لە واژۆکردن لە سەر ئەو پێشنیارە. لە پەیپەرێکی پێشوودا، کە لە گۆڤاری (نیو ئینگلاند) ی پزیشکیدا بڵاو کرایەوە، باسی پێویستی بێهاوتای نەخۆشەکان دەکات بۆ کەڵکوەرگرتن لە بەخشەرانی گورچیلە، کەمبوونەوەی مەترسییەکانی سەلامەتی، کەمبوونەوەی بەرچاوی تێچوونی دارایی ئەو پرۆسەیە، ڕاگرتنی بالانسی ڕێژەی مردن بە هۆی چاندنی گورچیلە و ئاستی توانای حکوومەت لە جێبەجێکردنی سیستمی قەرەبووکردنەوەی بەخشینی گورچیلەکان.

چەند هۆکارێکی تر هەیە بۆ هاندانی تەکنیککارانی بواری تەندروستی لەوانە:

- مەترسییەکانی بەخشینی گورچیلە زۆر کەمە، بەڵکوو وەک هەندێک نەشتەرگەریی جوانکاری وایە.

- به گشتی بەخشەرانی گورچیله، که یەک گورچیلەیان دەمێنێت لەو کەسانە زیاتر دەژین که خاوەنی دوو گورچیلەن.

- له ڕێگەی بەکارهێنانی بازاڕی یاسایی بۆ بەخشینی ئەندامانی جەستە، هەر یەکە له بەخشەرەکان و سوودمەندان ژیانیان پارێزراوتر دەبێت لەوانەی له ڕێگەی بازاڕی ڕەشەوە ئەم کارە دەکەن.

- ئەو گورچیلەیەی له کەسێکی بەخشەرەوە دەدرێت به نەخۆشێک زیاتر دەژین لەو کەسانەی که کەڵک له گورچیلەی کەسێکی مردوو وەردەگرن.

- له بازاڕی ڕەشدا، لایەنە بەخشەرەکان لەوانەیە له دوای نەشتەرگەریی چاودێریی تەندروستیی پێویستیان بۆ نەکرێت.

2. پاراستنی ئەندامەکانی جەستە

بازرگانیکردنی یاسایی تایبەت به بەخشینی خوێن له ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا، که ڕێگەیەکە بۆ قەرەبووکردنەوەی بەخشەران ڕێژەیەکی زیاتری بەخشینی خوێنیان

بەردەکەوێت بە بەراورد لەگەڵ قەرەبوو نەکردنەوەیان لە بەریتانیا. هەبوونی ترس لە سەر جۆری خوێن یان ئەندامە بەخشراوەکان هۆکاری سەرەکییە بۆ دەربڕینی نارەزایی، بەڵام لایەنگرانی بازرگانیکردن بە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ دەڵێن پشکنینی تەکنۆلۆژی لە ئێستادا وەک پێویست کاریگەریی خۆی نیشان داوە بۆ زامنکردنی سەلامەتیی بەخشین و دەستاودەستکردنی ئەندامەکانی جەستە. بە هۆی کەمیی بەخشینی ئەندامانی جەستە، زۆرێک لەو ئەندامانە لە نەخۆشەکان یان لە تەرمی مردوە بەساڵاچوەکانەوە وەردەگیرێت. لەوانەیە هەندێک کات ئەمە ببێتە هۆی سەرنەکەوتنی نەشتەرگەریی چاندنی یان ببێتە هۆی تووشبوون بە جۆرەکانی شێرپەنجە، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا چاوەڕوانی نەخۆشەکان، کە پێویستیان بە جۆرێکی کوالیتیی بەرزی ئەندامەکانە لەوانەیە ئەویش مەترسیدار بێت، چونکە زۆر جار ئەو نەخۆشانە ڕووبەڕووی مردن دەبنەوە.

## نەزانی و پەلەپەلکردن لە کاتی بەخشینی ئەندامەکاندا

هەر دوو پرۆفیسۆر پیکەر و ئیلیاس گەییشتنە ئەو دەرئەنجامەی کە نەزانی و پەلەپەلکردن لە کاتی بەخشینی ئەندامەکاندا دەکرێت خۆی لێ بپارێزرێت لە ڕێگەی بەدەستهێنانی ڕەزامەندییەکی دەستخەتی پابەندکارەوە. ئەوان دەڵێن قەرەبوونەکردنەوەی بەخشەرانی ئەندامەکانی جەستە وایان لێ دەکات هەست بە پەشیمانی بکەن، لە کاتێکدا پێیان وایە لە بڕیاردان لە سەر بەخشینی ئەندامی جەستەیان پەلەیان

کـردوە. هەندێک نـاوەنـدی چاندنی ئەندامانی جەستە لـە ڕێگـەی داهێنانی بەڵگەنامەیەکی پزیشکییەوە بە لایەنە بەخشەرە دوودڵەکان ئەم کێشەیان چارەسەر کردوە. قەرەبووکردنەوە بە کاش وەک جۆرێک لە چارەسەری ئەم کێشەیە پێشنیار کرا، لە پاڵ پێویستی بە ڕێژەیەکی زیاتر لە ئەندامانی جەستە، کە بۆی هەیە فشارەکان لە سەر خێزان و هاوڕێ و کەسە نزیکەکانی کەسی بەخشەر زیاتر بکات لە کاتی بڕیاردان لە سەر بەخشینی یەکێک لە ئەندامانی جەستەیان.

**چین**

کۆماری چین هیچ سیستمێکی بەیاسابیکردنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ پەیڕەو ناکات. لە کۆتاییی ساڵی 1980وە، چەندین ئاماژەبوونی هەیە لە سەر ئەو زیندانییانەی، کە لە سێدارە دراون ئەو ئەندامانەیان دەرهێنراوە، کە بۆ چاندنیان لە جەستەی کەسانر تر گونجاو بـوون، سـەرەڕای ئـەوەی کـە بەکارهێنانی ئەندامی جەستەی زیندانییە سزادراوەکان بە لەسێدارەدان بۆ چاندنیان یاساییە، چەندین

بەڵگە هەیە لە سەر ئەوەی، کە حکوومەتی چین هەوڵ دەدات بازنەی بەکارهێنانی ئەندامانی جەستە لە ڕێگەی ڕێکەوتنی نهێنییەوە کەم بکاتەوە. یاساکانی وەک یاسای کاتی تایبەت بەرکارە بۆ بەکارهێنانی تەرمی مردوەکان یان ئەندامانی جەستەی ئەو زیندانییانەی لە سێدارە دەدرێن، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا، هێشتا چین بەدەست کەمیی ئەندامی جەستەی ئامادە بۆ چاندن لە جەستەی ئەو کەسانەی پێویستیان پێیەتی گیرۆدە بوە.

لە ڕاپۆرتی کیلگۆر – ماتاس هاتوە «لە ڕابردوو تا ئەمڕۆیش لە ئاستێکی بەربڵاودا ئەندامانی جەستەی بێکەڵک بۆ چاندن هەیە و هەبوە». ڤالۆن گۆنگ لە ڕاپۆرتێکی تردا ئەمە پشتڕاست دەکاتەوە. دوای ماوەیەکی کورت، لێپرسراوانی حکوومەتی پەکین چەند یاسایەکی تازەیان ڕاگەیاند، کە بەکارهێنانی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە بێ وەرگرتنی ڕەزامەندیی خاوەنی ئەو ئەندامە قەدەغە کردوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا لە دوای تێپەڕبوونی ساڵێک بە سەر دەرچوونی ئەو

یاسایەدا لە سەر ئەرزی واقیع سەرنجی هیچ ئەنجامێک نەدراوە. حکوومەتی چین یاسایەکی دارشتوە کە سنورێکی بۆ فرۆشتنی ئەندامەکانی جەستە داناوە، بەڵام ئەم یاسایە ئێستا رێگر نییە لە بەدەستهێنانی ئەندامی جەستەی کەسانی لەسێدارەدراو.

چین چەند پرۆژە یاسایەکی تری پێشنیار کردوە بە ئامانجی یەکخستنی پرۆسەی کۆکردنەوەی ئەندامانی جەستە. ئەم یاسایە دیاریکردنی ئەو نەخۆشخانانەیش دەگرێتەوە، کە دوور نییە چەندین کەسیان لە سەر جێگە تیادا مردبێت، لە کاتێکدا ئەندامانی جەستەیان بۆ چاندن لە جەستەی کەسانی تردا گونجاوە، جگە لەمەیش یاساکان رێگرن لە چاندنی ئەندامانی جەستەی بیانییەکان بۆ هاوڵاتییانی چین. لە ساڵی 2009دا لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ مانفرێد نۆڤاک، بریاردەری تایبەتی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ کاروباری ئەشکەنجەدان گوتی: «حکوومەتی چین هێشتا پابەند نەبووە بە پێوەرەکانی شەفافیەتی نێودەوڵەتییەوە، بەڵام ئێمە دەبینین

کە چۆن ئاستی چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە نەخۆشخانەکانی چین بە شێوەیەکی بەرچاو لە ساڵی 1999وە زیادی کردوە، لە کاتێکدا ژمارەیەکی بەرچاوی بەخشەرانی ئەندامەکانیان بوونی نییە. نۆڤاک هەستا بە ناردنی دوو ڕاپۆرت بۆ ئەنجوومەنی مافەکانی مرۆڤی سەر بە نەتەوە یەکگرتوەکان، کە بە فەرمی داوا لە حکوومەتی چین دەکات وەڵامی ئەو دەنگۆ و پڕوپاگەندانە بداتەوە.

**چەند زانیارییەکی شۆکهێنەر دەربارەی بازرگانیکردن**

**بە ئەندامانی جەستە لە چین**



| چاندنی ئەندامەکان | سالانە 10000 ئەندامی جەستەی مرۆڤ لە چین دەچێنرێت |
|---|---|
| بەهای یەک گورچیلە | 10000 دۆلار دەدرێت بە هەر کەسێک گورچیلەیەکی ببەخشێت |
| کرێی یاریدەدەران | کارمەندی هونەری 3000 دۆلار - برینپێچ 1500 دۆلار |
| کرێی پزیشکی بێهۆشکردن | 5000 دۆلار |
| داهاتی ساڵانە | داهاتی ساڵانەی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە یەک ملیار دۆلارە |

**هیندستان**

پێش ئەوەی بچینە سەر یاسای تایبەت بە ڕێکخستنی پرۆسەی چاندنی ئەندامی جەستەی مرۆڤ (THOA) کە لە ساڵی 1994 دەرچووە، دەکرێت بڵێین هیندستان یەکێک بوو لە دەوڵەتە سەرکەوتووەکان لە ڕووی بەڕێوەبردنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە شێوەیەکی یاسایی و بە لەبەرچاوگرتنی پێوەرەکان. تێچوونی کەم و ڕاکێشانی کار و کڕیاران لە هەموو جیهانەوە بۆ هیندستان هۆکارێکی سەرەکییە بۆ گەشەکردنی یەکێک لە

گەورەترین سەنتەرەکانی چاندنی گورچیلە لە جیهاندا لە وڵاتی هیندستان، لەگەڵ ئەوەیشدا، زۆرێک کێشە و گرفت بەدەرکەوتن، بەڵکوو لە هەندێک حاڵەتدا نەخۆشەکان نازانن کە نەشتەرگەریی دەرهێنانی گورچیلەیان بە کرداریی ڕووی داوە. لە چەند حاڵەتێکی تردا، بەخشەرانی ئەندامانی جەستەیان بەڵێنیان پێ دەدرێت لە دوای نەشتەرگەرییەکە قەرەبووی دارایی دەکرێنەوە، بەڵام ئەم کارە بە شێوەیەکی ڕاستەقینە ڕوو نادات.

سەرەڕای ئەم کێشانە چەندین کێشەی تری ئاکاریی پاڵی بە حکوومەتی هیندستانەوە ناوە بۆ ئەوەی یاسای نوێ دەربکات بۆ ئەوەی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بنبڕ و قەدەغە بکات. لە ڕاستیدا ئەو یاسایانەی ئێستا لە هیند بەرکارن یاسای لاوازن و فرتوفێڵیان تێدا دەکرێت. بۆ نموونە یاسای THOA باس لەوە دەکات، کە پێویستە کەسی بەخشەر یەکێک بێت لە خزمە نزیکەکان، یان هاوسەر بێت یان هەر تاکێکی ئاسایی کە بە هۆکارێکی خێرخوازانە ئەو

ئەندامەی جەستەی دەبەخشێت. لە زۆر حاڵەتدا پرۆسەی بەخشین بە هۆکاری چاکەخوازی یان خێرخوازیی نییە، چونکە هیچ پێوەندییەک لە نێوان کەسی بەخشەر و کەسی سوودمەندا بوونی نییە، بەڵکوو تەنانەت خەڵکی ئەو وڵاتەیش نییە و بە زمانی ئەوانیش قسە ناکات.

**ئێران**

یاساکانی ئێران ڕێگە دەدات بە فرۆشتنی گورچیلەکان لە بەرانبەر بەدەستهێنانی پارەدا. ئێستا هیچ نەخۆشێک نییە لە ئێران کە چاوەڕوانی چاندنی گورچیلە بکات، بەڵکوو کۆمەڵەیەکی خێرخوازی بۆ یارمەتیدانی نەخۆشانی گورچیلە بە ناوی (CASKP)، لەگەڵ دامەزراوەیەکی خێرخوازی گەورەی بۆ گرینگیدان بە نەخۆشییە تایبەتییەکان بە ناوی (CFSD) ئەم ئەرکەیان لە ئەستۆ گرتوە بۆ ڕێکخستنی پرۆسەی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە پشتیوانی و یارمەتیی حکوومەتی ئێران، کە بە شێوەیەکی گشتی بۆ هەر کەسێکی بەخشەری گورچیلە بڕی 1200 دۆلاری پێ دەدات،

هەروەها هاوكارى ئەو نەخۆشانەيش دەدات، كە سوود لە چاندنى ئەو ئەندامانە وەردەگرن و توانای دابینکردنی تێچوونە داراییەکەیان نییە.

هەندێک لە ڕەخنەگران پێیان وایە حکوومەتی ئێران لەو ڕووەوە کەمتەرخەم و بێباکە، چونکە زیاتر لە 70%ی لایەنە بەخشەرەکان بە گوێرەی پێوەرەکانی ئێران کەسانی کەمدەست و هەژارن، بەڵام لە پاڵ ئەمەیشدا لە مەودای نزیک یان دووردا وەک پێویست چاودێریی تەندروستیی بەخشەرانی ئەندامانی جەستە ناکرێت. لە ڕاستیدا بەڵگە لە بەردەستدا هەیە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە چاکەی بەخشەرە ئێرانییەکان بە شێوەیەکی خراپ بە سەریاندا دەشکێتەوە، لە لایەنی تەندروستیی جەستەیییەوە یان تەندروستیی دەروونییەوە.

### فلیپین

لە ساڵی 2008دا فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە وڵاتی فلیپین کارێکی یاسایی بوو، بەمەیش ئەو وڵاتە ببوە جێگەی مەبەست بۆ گەشتیارانی تایبەت بە چاندنی

ئەندامانی جەستە. ئاژانسی هەواڵگریی فلیپین لە ژێر چاودێریی حکوومەتدا ڕێگەی خۆش کرد بۆ پرۆسەیەکی گشتگیر بۆ نەشتەرگەرییەکانی چاندنی گورچیلە، کە تێچووەکەی نزیکەی 25000 دۆلاری ئەمەریکییە. حکوومەتی فلیپین لە ئاداری ساڵی 2008وە بازرگانیکردنی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ قەدەغە کردوە. لەو کاتەوەی ئەم بڕیارە خراوەتە بواری جێبەجێکردنەوە، ئاستی نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامەکان لە ساڵی 2010دا لە 1046 نەشتەرگەری بۆ 511 نەشتەرگەری دابەزی. پرۆفیسۆر لیمیندۆزا لەو بڕوایەدایە، کە دابەزینی ئاستی ئەو گەشتیارانەی بۆ نەشتەرگەری چاندنی ئەندامەکان دێنە وڵاتەکە هۆکارە بۆ گەشەکردنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە بازاڕی ڕەشدا، بەڵام قەدەغەکردنی بازرگانیکردن بەو ئەندامانەی جەستە مەسەلەی قەرەبووکردنەوەی بەخشەران لە سەر بنەمای گرێبەست و ڕێکەوتن لە نێوان لایەنە بەخشەرەکان و کڕیاران و باندەکاندا گەشە پێ دەدات.

بەپێی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی (WHO)، بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لەو کاتەدا ڕوو دەدات، کە ئەندامەکان لە جەستەی مرۆڤ دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی مامەڵەپێکردنی بازرگانی. ئەو ڕێکخراوە ئاشکرای کردوە "پێدانی پارە لە پێناو بەدەستهێنانی ئەندامی جەستەی مرۆڤ بۆی هەیە شێوازێکی نادادییانە وەربگرێت سەبارەت بە خێزانە هەژارەکان و چین و توێژە لاوازەکانی کۆمەڵگە، چونکە بەخشینەکە بۆ بەدەستهێنانی قازانج و بازرگانیکردنە بە مرۆڤ. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم جۆرە بازرگانیکردنە کارێکی نائەخلاقی و نامرۆڤانەیە، بەڵام تێبینی دەکرێت لە ساڵی 2005دا ڕێژەی 5%ی کۆی ئەوانەی سوودیان لێ وەرگرتوە بەشدارییان لە پرۆسەی چاندنی ئەندامەکانی جەستەدا کردوە، واتا بۆیان چێنراوە. توێژینەوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن کە بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە بەرزبوونەوەی

بەردەوامدایە و نوێترین ڕاپۆرتی ڕێکخراوی دەستپاکیی دارایی جیهانی ئاشکرای کردوە، کە داهاتی ساڵانەی بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە زۆربەی وڵاتاندا لە نێوان 600 ملیۆن دۆلار تا 1.2 ملیار دۆلاردایە.

**دیارترین ئەو دەوڵەتانەی بازرگانیی نایاساییان بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ تێدایە**

| ناوی دەوڵەت | ڕێژەی % |
|---|---|
| ئەنگۆلا | 32% |
| ناوچەی بەڵکان | 38% |
| بەرازیل | 40% |
| کەنەدا | 28% |
| کۆلۆمبیا | 45% |
| کۆستاریکا | 47% |
| چین | 43% |
| ئیکوادۆر | 39% |
| جۆرجیا | 32% |
| هاییتی | 25% |
| هیندستان | 31% |
| مەکدۆنیا | 22% |
| مەکسیک | 24% |

| | |
|---|---|
| پاکستان | 21% |
| پیرۆ | 33% |
| فلیپین | 37% |
| ڕووسیا | 18% |
| باشووری ئەفریقیا | 19% |
| بەریتانیا | 12% |
| ویلایەتە یەککرتوەکانی ئەمەریکا | 9% |

تۆڕە تاوانکارییەکان لە ئاستێکی باڵادا کاریان کردوە لە سەر ڕفاندنی منداڵان و هەرزەکاران بۆ مەبەستی بازرگانیکردن پێیانەوە، پاشان دەگوازرێنەوە بۆ ئەو جێگایانەی، کە کەلوپەل و ئامێری پزیشکی پێویستیان تێدایە بۆ ئەوەی لە ناویان ببەن و ئەندامەکانی جەستەیان دەربهێنن تا لە بازاڕی ڕەش بازرگانییان پێوە بکەن، واتە بیانفرۆشن بۆ دەستکەوتنی پارە. هەژاری و هەبوونی کەلێن لە ناو یاساکانی دەوڵەت بە هەمان شێوە یارمەتیدەرە لە بووژانەوەی بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ.

لە ڕاستیدا نەداری و هەژاری لە هەموو ئەو وڵاتانەدا کە ئەم جۆرە بازرگانییەیان تیادا ئەنجام دەدرێت بە زەقی بوونی هەیە و هاندەرە بۆ گەشەکردنی بازرگانییەکە. هەر وەک لە

پێشدا تیشکی خرایه سەر، یاسا و ڕێسا لاواز و پڕ کەموکورتییەکانی وەک یاسای چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە هیندستان بۆ نموونە هۆکارە بۆ بەردەوامبوونی ئەم جۆرە بازرگانییە لەو وڵاتەدا، کە بە گشتی خاوەنی دانیشتوانێکی زۆرە و ڕێژەیەکی زۆری خێزانەکان زۆر هەژارن.

## مێژووی بازرگانیکردن
## بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی حکوومەتە لۆکاڵییەکان ساڵانێکی زۆر هەوڵ و تەقەللایان داوە بۆ گەییشتن بە چەند ڕێگەیەکی ئاکاریی (ئەخلاقی) بە مەبەستی ڕێکخستنی چۆنێتیی مامەڵەکردن لەگەڵ بەرزبوونەوەی خواست لە سەر نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامانی جەستە بۆ نەخۆشەکان. لە ساڵی 1968دا، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا چەند یاسایەکی دەرکرد بۆ یەکخستنی یاسای تایبەت بە

بەخشینی ئەندامانی جەستە، ئەمەیش مافی دایە تاکەکان تاوەکوو لە دوای مردنیان ئەندامەکانیان ببەخشرێت بە کەسانی تر، کە ئەوپەڕی پێویستیان پێی هەیە. لە داهاتوودا و بە دیاریکراوی لە ساڵی 1984، ویلایەتە یەککگرتوەکان تۆڕی نیشتیمانی چاندنی ئەندامانی جەستەی دامەزراند و تۆمارێکی تایبەتیشی بە بەخشەرەکان لە سەر تۆڕی ئینتەرنێت دروست کرد، بۆیە لە ئێستادا کڕینوفرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە ئەمەریکا قەدەغە کراوە. زۆرێک لە وڵاتانی تری جیهان یاسایان دارشت بە ئامانجی کۆتاییهێنان بە بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ. بۆ نموونە لە باشووری ئەفریقیا لە ساڵی 1983دا پلانی ریشاڵە مرۆییەکان دامەزرێترا، کە گواستنەوەی ڕیشاڵەکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تری قەدەغە کرد (بە گۆشتی جەستە، ئێسقان، شلەکانی ناو لەشی مرۆڤیشەوە) لە بەرانبەر بەدەستهێنانی پارەدا.

**دادگاییکردنی بازرگانانی نایاسایی**
**بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ**

سەرەڕای هەبوونی گرفت لە سەلماندنی هەبوونی بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستە و بە هۆی کەمیی بەڵگە و دۆکیۆمێنت و داتای باوەڕپێکراو، بەڵام لە زۆر وڵاتدا هەوڵ دراوە بۆ دادگاییکردنی بازرگانانی بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ. داتا و ئامارەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە ڕێژەی 42%ی ئەندامە چێنراوەکان لە جەستەی کەسانی تردا لە ڕێگەی بازرگانانی نایاساییەوە دەست دەکەوێت. بۆ نموونە لە ساڵی 2008دا، پۆلیسی شاری دەلهیی پایتەختی هیندستان لە نزیک شارۆچکەی جێرگوان سەنتەرێکی نایاسایی چاندنی گورچیلەیان دۆزییەوە، کە لە لایەن کەسێکەوە بەڕێوە دەبرا بە ناوی ئەمیت کۆمار. ئەو سەنتەرە نایاساییە بە هۆی تەکنۆلۆژیای پەنجەمۆرەوە ئاشکرا بوو، کاتێک دەرکەوت کە کۆمار و ڕۆس لە ڕاستیدا هەمان یەک کەسن، دوای ئەوەی بە درێژایی چەندین ساڵ هەستابوو بە بەکارهێنانی

چەندین ناوی خوازراو بۆ ئەنجامدانی کار و چالاکییە نایاساییەکانی. کۆمار ڕووبەڕووی چەند تۆمەتێک کرایەوە بە هۆی تێوەگلانی لە بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، کە سنوری نەشتەگەریی چاندنی 600 گورچیلەی تێپەڕاند، جگە لەوەیش دوو نەخۆشخانانەی ئەو وڵاتە لەو تاوانەدا تێوەگلان.

لە ساڵی 2007دا، کەسێک بە ناوی (بات) لە بەریتانیا، بوە یەکەم کەس کە بە پێی یاسای ڕیشاڵە مرۆییەکان تۆمەتبار کرا، دوای ئەوەی هەوڵی دا بۆ فرۆشتنی گورچیلەی خۆی لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە بە بەهای 24000 جونەیهی ئەستەرلینی بۆ ئەوەی بتوانێت قەرزەکانی سەر ئەستۆی بداتەوە. لە تەمووزی ساڵی 2009 لە برۆکلین کەسێک بە ناوی ئیسحاق ڕۆزنباوم بە تۆمەتی پلانداناان بۆ ڕێگەخۆشکردن بۆ پرۆسەی فرۆشتنی گورچیلەی هاوڵاتییەکی ئیسرائیلی بە ئەفسەرێکی نووسینگەی نهێنیی لێکۆڵینەوە فیدراڵییەکانی ئەمەریکا بە بڕی 160000 دۆلار تاوانبار کرا. بە گوێرەی ئەو تۆمەتانەی ئاراستەی ڕۆزنباوم کران، ناوبراو دانی پێ دا

بەوەدا نا، کە بۆ ماوەی 10 ساڵ بەشداری کردوە لە پرۆسەی فرۆشتنی گورچیلەی مرۆڤ بە شێوەیەکی نایاسایی. بە وتەی ڕالف مورە، داواکاری گشتیی ئەمەریکا «کاری ئەو بریتی بوو لە چەشەکردنی خەڵک تاکوو دەستبەرداری گورچیلەیان ببن بۆ ئەوەی بەرانبەر بە 10000 دۆلار لێیان بکرێت و پاشان خۆی بە بڕی 160000 دۆلار دەیفرۆشتنەوە».

نانسی شیپەر هیوز، شارەزای بواری ئەنترۆپۆلۆژیا و بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ئاشکرای کرد، کە بە نووسینگەی لێکۆڵینەوەکانی فیدراڵیی ئەمەریکای ڕاگەیاندوە، کە ڕۆزنباوم ماوەی 7 ساڵ کەسایەتیی سەرەکی بوە لە دەزگای بەقاچاغبردنی نێودەوڵەتی. ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەی بە خواستی خۆیان دەیانەویست ئەندامەکانی جەستەیان بە ڕۆزنباوم بفرۆشن لە ئەورووپای خۆرهەڵاتەوە هاتبوون بۆ ئەمەریکا. بە پێی چەندین ڕاپۆرت کە بڵاو کرانەوە، ڕۆزنباوم بە بەکارهێنانی چەک هەڕەشەی لە بەخشەرانی ئەندامەکانی جەستە کردوە، تا

دڵنیا بێت لە زامنکردنی تەواوکردنی پرۆسەی کڕینوفرۆشتنەکە، بەڵام لە ساڵی 2011دا سەلمێنرا، کە ڕۆزنباوم لە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ تێوەگلاوە.

لە ساڵی 2010دا لە باشووری ئەفریقیا، کۆمپانیایەکی تایبەت بە ناوی (نێت کیر کوازولو)ی سنوردار تێوەگلا لە یارمەتیدانی 102 کەس بۆ بەشداریکردن لە کار و چالاکیی نایاسایی تایبەت بە نەشتەرگەرییەکانی چاندنی گورچیلە، هەروەها کۆمپانیایەکی تایبەتی دیکەیش لەگەڵیدا تۆمەتبار کرا، کە دەرفەتی کاری دابین کردوە بۆ 4 پزیشکی تایبەتمەند لە چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ. تۆمەتەکان ئاراستەی کۆمپانیای سەرەکی (نێت کیر کوازولو) کرا، کە بە هۆیەوە سەرۆکی جێبەجێکاری کۆمپانیاکە (ڕیچارد فریدلاند) دەستگیر کرا لە پێناو دانپێدانانی بەو تاوانانەدا، کە لەو نەخۆشخانەیە لە دژی قوربانییەکان ئەنجام دراوە. کۆمپانیای (نێت کیر کوازولو) لە 109 نەشتەرگەریی چاندنی گورچیلە

بە شێوەیەکی نایاسایی و ئەو کارانەیشی گەییشتنە ئیسرائیل، ڕۆمانیا و بەرازیل و تەنانەت ناکامەکانیشی گرتەوە.

لە کانوونی یەکەمی ساڵی 2010، هاوڵاتییانی تورکیا تێوەگلانی چەند بازرگانێکیان لە بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ئاشکرا کرد لە وڵاتی کۆسۆڤۆ، هەروەها لە ساڵی 2013دا لیژنەیەکی دادوەری نێودەوڵەتی سەر بە یەکێتیی ئەورووپا، کە پەیوەستە بە سەروەرکردنی یاسا لە کۆسۆڤۆ، تێوەگلانی 5 بازرگانی لەو بازرگانییە نایاساییە تۆمەتبار کرد. لە ساڵی 2014دا، سەرۆکی باندێکی مەکسیکی دەستگیر کرا، کە هەستابوو بە ڕفاندن و کوشتنی منداڵانی ناکام. تەرمی ئەو منداڵە قوربانییانە لە ناو بارهەڵگرێکی ساردکەرەوەدا دۆزرانەوە، کە بەتانیان تێوە پێچرابوو. چەند سەرچاوەیەکی جیاواز ڕایان گەیاند، کە ئەو سەرۆک باندەی دەستگیر کراوە سەر بە تۆڕێکی کوشتن و ڕفاندنی منداڵە ناکامەکانە، کە لە دوای دەرهێنانی ئەندامانی جەستەیان دەیانکوژن

و تەرمەکانیان فڕێ دەدەن. هەمان ئەو تۆڕە تاوانکارە بە ئەنجامدانی چەندین کردەوەی تریش تاوانبار کراون، بە تایبەتی بازرگانیی بە مادده هۆشبەرەکان، فێڵ و تەڵەکەبازیکردن، دەرهێنانی کانزاکان بە نایاسایی و بڕینی دار و درەختەکان بە نایاسایی.

### دیدگاو پێشبینییەکانی هۆیەکانی ڕاگەیاندن

بە درێژایی چەندین دەیەی ڕابردوو لە ڕێگەی کەناڵەکان و هۆیەکانی ڕاگەیانەوە زۆرێک دید و پێشبینی دروست بوە دەربارەی بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ. چیرۆکی خەیاڵی ڕۆبن کوک لە ساڵی 1977، کە لە فیلمی مایکڵ کرایتۆن بەرجەستە کراوە، باشی چیرۆکی چەندن نەخۆشێکی بێئاگا دەکات، کە لە دۆخێکی بێئاگایی تەواودا دانراون لە پێناو دەرهێنانی ئەندامەکانی جەستەیان. بە هەمان شێوە کتێبی شەمەندۆفێری منداڵ، کە لە لایەن لبیرنارد دانراوە لە پێش ساڵی 1993، باس لە چیرۆکی پیاوێک دەکات، کە بە سەر

شۆکی لەدەستدانی یەکێک لە گورچیلەکانی لە خەو هەڵساوە لە دوای بەسەربردنی شەوێک لەگەڵ یەکێک لە لەشفرۆشەکان لە ناو یانەیەکی شەوانەدا. ئەمە سەرەڕای چەندین چیرۆک و بەسەرهات و فیلمی تر، کە بە گشتی ناوەرۆکەیان باسی بازرگانانی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دەکات لە ڕێگەی شاشەکانی تەلەفزیۆن و گۆڤارەکانی تابلۆید و مەسجە ئەلیکترۆنییەکانی ئینتەرنێت.

زۆرێک لە چیرۆک و بەسەرهاتەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، کە لە ڕێگەی هۆیەکانی ڕاگەیاندنەوە وێنا کراوە، لە ناوەرۆکیاندا باس لە چەند ڕووداوێکی دروستکراو دەکەن، کە هیچ بنەمایەکی ڕاست و دروستیان نییە. ڕەخنەگرانی وەک سیلک مایەر پێیان وایە ئەم تێڕوانینە بۆ بابەتی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ئامانجی بەدەستهێنانی ناو و ناوبانگە و زۆر جاریش وەکوو خورافە لێی دەڕوانرێت و سەرنجەکە لە سەر دیوی ڕاستەقینەی

بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لادەبات. ئەو توێژەر و ڕەخنەگرانە داوا دەکەن توێژینەوە زانستییەکان سەبارەت بە ئەم جۆرە بازرگانییە زیاد بکرێت، بە جۆرێک کە ئەو ئەفسانانەی دەربارەی ئەم بازرگانییە دروست دەکرێت، بگۆڕرێت بۆ ڕاستیەکی زانستییانە. مایەر دەشڵێت: «کاتێک بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ببێتە کارێکی جددی، تەنها ئەو کاتە هەموو حکوومەتە زەرەرمەندەکان پێکەوە کار دەکەن بۆ دروستکردنی زەمینەیەکی پتەو لە ڕووی دروستکردنی سیاسەتەکانی تایبەت بەم بوارە».

## چەند زانیارییەک دەربارەی بازرگانیکردن

## بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ

| داهاتی ساڵانەی ئەم بازرگانییە | 5 تا 8 ملیار دۆلاری ئەمەریکی |
| --- | --- |
| ژمارەی ئەو نەخۆشانەی ساڵانە چاوەڕوانی وەرگرتنی یەکێک لە ئەندامەکان دەکەن | 80000 |
| ژمارەی نەشتەرگەرییەکان لە ساڵێکدا | 66000 |
| نرخی یەک گورچیلە لە بازاڕی ڕەش | 160000 دۆلار |
| نەشتەرگەریی چاندنی جگەر/ ساڵانە | 21000 |
| نەشتەرگەریی چاندنی دڵ/ ساڵانە | 6000 |
| نرخی چاندنی ئەندام بە گەشتیاریی | 157000 دۆلار |
| نرخی گلێنەی چاو | 24400 دۆلار |
| نرخی هێلکۆکەیەکی نەپیتێنراو | 12400 دۆلار |
| نرخی پێست و ئێسقانەکان | 5460 دۆلار |

**بازاڕی سوور**

لە ساڵی 2011دا، سکۆت کارنی دەستەواژی (بازاڕی سوور)ی بە کار هێنا بە مەبەستی وەسفکردنی توێژێکی فراوانی ئاڵوویرە ئابوورییەکانی پەیوەست بە لەشی مرۆڤ. کارنی دەڵێت: «پیشکەوتنی زانستەکان بوەتە هۆی زیادبوونی خواست لە سەر چەند ئەندامێکی جەستەی مرۆڤ، بۆیە ئەم خواستە زیاد بوە وای کردوە بازاڕی سوور فراوانتر بێت، کە کۆمەڵێکی فراوانی ئاڵوویر و سەوداکان دەگرێتەوە هەر لە فرۆشتنی ئەندامەکەوە تا دزینی، هەروەها دزینی ئێسقانەکانیش، تا دەگاتە بەکرێگرتنی ڕووبەرێک لە منداڵدانی ئافرەت».

بە باسکردنی چەمکەکانی بازاڕی ڕەش، سپی و خۆڵەمێشی، سکۆت کارنی ئامادە بۆ ئەوە دەکات، کە بازرگانیکردن بە چەند بەشێک لە جەستەی مرۆڤ تایبەتییە، چونکە جەستەکان کاڵایەک نین بە واتای وردی وشەکە، بەڵکوو بریتییە لە بەشێکی جەستە و بەهاکەی بەهایەکی نەختینەیی نییە. سەرەڕی ئەمەیش، کارنی لەو بڕوایەدایە، کە بازرگانیکردن بە چەند بەشێکی

جەستەی مرۆڤ جۆرێک لە قەرزی هەتاهەتایی لە نێوان بەخشەر و کەسی سوودمەندا دروست دەکات. بازرگانیکردنی ڕاستەوخۆ بە چەند بەشێکی جەستەی مرۆڤ لە بەهای مرۆڤ کەم دەکاتەوە و دەیگەیەنێتە ئاستی «بەهای گۆشت». کارنی داوایش دەکات شەفافییەتی ڕادیکاڵانە لە ناو بازاڕی سووردا هەبێت لە پێناو پارێزگاریکردن لە مرۆڤایەتی.

### بارودۆخی ئێستا

بەپێی دوایین بڵاوکراوەی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی دەربارەی دۆخی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە سەر ئاستی جیهانی، تەنها لە ساڵی 2005دا 66000 نەشتەرگەریی چاندنی گورچیلە و 21000 نەشتەرگەریی چاندنی جگەر و 6000 نەشتەرگەریی چاندنی دڵ لە سەر ئاستی جیهان ئەنجام دراوە. لە ساڵی 2008 ئەم ڕێکخراوە ڕای گەیاندوە، کە ماوەی دیاریکراو بۆ چاوەڕوانیکردن تا بەدەستهێنانی ئەندامی جەستە لە ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا بە

مەبەستی چاندنی بۆ کەسی نەخۆش 3 ساڵە، لە هەمان کاتیشدا لە بەریتانیا 8000 نەخۆش زۆر پێویستیان بە دەستکەوتنی یەکێک لەو ئەندامانە هەبوە و ڕێژەکەیش لە ساڵی دواییدا بە ڕێژەی 8% زیادی کردوە. بەرزبوونەوەی خواست لە سەر ئەندامەکانی جەستە و ئەو لیستە دووورودرێـژەی بوونی هەیە، هاوکاتە لەگەڵ فراوانبوونی قەبارەی بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ. دوایین داتا و ئامارەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە نزیکەی 10%ی سەرجەم نەشتەرگەرییەکانی چاندنی ئەندامەکان بە شێوەیەکی نایاسایی ئەنجام دەدرێت، بە تایبەتی لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە، لەبەر ئەوەی پرۆسەکە مسۆگەرترە.

یەک سەرچاوە پێشبینیی ئەوەی کردوە، کە لە ساڵی 2006دا لانی کەم 4000 بەندکراو لە سێدارە دراون لە پێناو دەستەبەرکردنی نزیکەی 8000 گورچیلە و 3000 جگەری مرۆڤ بۆ کڕیارە بیانییەکان. لە ساڵی 2007دا تەها لە وڵاتی پاکستان 2500 نەشتەرگەریی چاندنی گورچیلە ئەنجام دراوە، ئەگەر بزانین،

کە سوودمەندە بیانییەکان ڕێژەی دوو لە سەر سێی نەشتەرگەرییەکانی چاندنی ئەندامەکان پێک دەهێنن. کۆمەڵەی خێرخوازی تەندروستی لە هیندستان پێشبینی کردوە، کە هەموو ساڵێک 2000 هاوڵاتیی هیندستانی گورچیلەکانیان بۆ بەدەستهێنانی بژێویی دەفرۆشن. بە بۆچوونی شارەزایان لە کەنەدا و بەریتانیا نزیکەی 30 تا 50 نەخۆش ئەم ئەندامانەی جەستە، کە پێویستیان پێی بوە لە ڕێگەی دەرەوەی وڵاتەکانیان کڕیویانە.

## چاندنی ئەندامی جەستە بە شێوازی گەشتیاری

تۆڕی یەککگرتووی بەشدارانی ئەندامانی جەستە، ئاشکرای کردوە، کە ئەندامە پێویستەکانی جەستە لە دەرەوە دەکڕرێت، بە مەبەستی گەییشتن بە بەدەستهێنانیان لە دوای تێپەڕاندنی هەموو یاسا پێوەندیدارەکانی کە لە ناو وڵاتەکان کاریان پێ دەکرێت. دەستەواژەی «چاندنی ئەندامەکان بە شێوازی گەشتیاری» باس لەو چالاکییە بازرگانییە دەکات، کە ئامانجی چاندنی ئەندامەکانی جەستەیە لە دەرەوە بە

ڕێگەی نایاسایی، بەڵام هەموو گەشتکردنێکی پزیشکی بۆ چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ نایاسایی نییە. بۆ نموونە، لە هەندێک حاڵەتدا هەر یەکە لە کەسی بەخشەر و کەسی وەرگر گەشت دەکەن بەرەو وڵاتێکی دیاریکراو لەگەڵ هاوەڵێکدا بۆ ئەوەی نەشتەرگەرییەکە بە شێوەیەکی نایاسایی لەوێ ئەنجام بدەن. لە هەندێک حاڵەتی تردا، کەسی وەرگر یان سوودمەند لە بەدەستهێنانی ئەندامێکی جەستە گەشت دەکات لە پێناو بەدەستهێنانی ئەندامێک لە یەکێک لە خزمەکانی، کە لە وڵاتێکی دەرەوە دەژی.

لە ڕاستیدا چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە ڕێگەی گەشتیارییەوە بوەتە هۆی دروستبوونی مەترسی، چونکە بریتییە لە گواستنەوەی چەند ئەندامێکی سەلامەت و بێکێشە بە یەک ئاراستەدا، لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەو ناوچانەوە، کە نەشتەرگەرییەکانی تێدا ئەنجام دەدرێت. وەک هەمیشە چاندنی ئەندامانی جەستە بە دوو ئاراستە دەبێت: لە باشوورەوە بەرەو باکوور، واتە «لە دەوڵەتە تازە پێگەییشتوەکان

بەرەو دەوڵەتە پێشکەوتوەکان»، لە ڕەگەزی مێیینە بۆ ڕەگەزی نێرینە و لە ڕشپێستەکانەوە بۆ سپیپێستەکان.

لە چوارچێوەی پرۆسەی گەشتیاری بۆ چاندنی ئەندامەکان، گورچیلە لە هەموویان بازاڕی گەرمترە و نرخی لە نێوان 1300 دۆلار تا 150000 دۆلارە. لە ڕاستیدا چەندین ڕاپۆرتی تایبەت بەم بوارە ئاشکرایان کردوە، کە 75%ی پرۆسەی بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ گرینگی بە گورچیلە دەدات. هەروەها چاندنی جگەر لە چوارچێوەی بازرگانیکردنی گەشتیاری بە ئەندامانی جەستە نرخی لە نێوان 4000 دۆلار تا نزیکەی 157000 دۆلارە. سەرەڕای ئەوەی کە ڕۆڵی جگەر لە لەشدا بە بەردەوامی نوێ دەبێتەوە، بەڵام بەخشینی جگەر بکوژ و مەترسیدار نییە، بەڵکوو کەمتر باوە بە هۆی کەمیی ماوەی بەپاکیهێشتنەوەی لە قۆناغی دوای دەرکردنی ئەندامەکە، ئەمەیش هۆشدارییە بۆ لایەنە بەخشەرەکان و ترس و نیگەرانییان زیاتر دەکات. کاتێک بابەتەکە

پەیوەستە بە بازرگانیی نایاساییەوە، دەبینین گلێنەی چاو یەکێکە لەو ئەندامانەی، کە نرخی گرانە و دەگاتە 24400 دۆلار، هەروەها نرخی هێلکۆکەیەکی نەپیتێنراو دەگاتە 12400 دۆلار، لە کاتێکدا هەندێک پێکهاتەی تر هەرزانە وەک خوێن کە لە نێوان 25 تا 337 دۆلاردایـە، هەروەها پێست و ئێسقانەکان هەرزانە، کە بە گشتی دەگاتە 5460 دۆلار. خواست لە سەر ئەندامە ژیارییەکانی وەک دڵ و سییەکان زۆر بەرزە، لەبەر ئەوە چاندنی ئەندامەکان لە ڕێگەی گەشتیاری و بازرگانیکردنی نایاسایی بەم جۆرە ئەندامانە زۆر دەگمەنە، ئەوەیش بە هۆی سروشتی ئاڵۆزی ئەنجامدانی نەشتەرگەری بۆ چاندنی ئەو ئەندامەی، کە دەخوازرێت بۆ نەخۆشەکە بچێنرێت.

**کاردانەوەی جیهان**

کۆمەڵی نێودەوڵەتی زۆرێک پرۆتۆکۆل و بەڵێننامە و بەیاننامەی لە دژی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤی دەرکـردوە. لـە سـاڵی 1985دا خـاوەنـدارێتیی دەرمـانـی جیهانی سەرکۆنەی ئـەم جـۆرە بازرگانییەی

کرد و ناڕازیبوونی خۆی بەرانبەر بەکارهێنانی ئـەنـدامـانـی جـەسـتـەی مـرۆڤ بـۆ مەبەستی بازرگانی ڕاگەیاند. ئەنجوومەنی ئەورووپا لە ڕێکەوتننامەی مافەکانی مرۆڤ لە ساڵی 1997 و 2002، هەروەها پرۆتۆکۆلی خۆویستانەی تـایـبـەت بـە چـانـدنـی ئـەنـدامـەکـان و ڕیشاڵە مرۆییەکان و ڕاگەیاندنی ئەستەنبوڵ تایبەت بە بازرگانیکردن بە ئەندامەکانی جەستە و گەشتکردن بۆ چاندنی ئەندامەکان، هەموویان پێداگرییان کـردوە لە سەر قەدەغەکردن یان سنوردارکردنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ.

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی WHO ڕۆڵێکی بـاڵای گـێـڕاوە لـە سـەرکـۆنـەکـردن و تۆمەتبارکردنی بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مـرۆڤ، بەڵکوو یەکەمین ڕێکخراو بـوو، کە لە ساڵی 1987دا بابەتی بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ئاشکرا کرد، ئاماژەیشی بۆ ئەوە کردوە، کە ئەم جۆرە بازرگانییە نایاساییە پێشێلکردنی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤە. لە ساڵی 1991، کـۆمـەڵـەی تەندروستیی جیهانی 9 بنەمای سەرەکیی تایبەت بە چاندنی ئەندامانی

جەستەی مرۆڤ پەسەند کرد. ئەم بنەمایانە بە ڕوونی باس لەو بیرۆکەیە دەکەن، کە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ نابێت بە هیچ شێوەیەک ببێتە کاڵایەک یان بابەتێک بۆ مامەڵەپێکردن و ئاڵوویری دارایی. لە 22ی ئایاری ساڵی 2004دا ئەم 9 بنەما ئاراستە کراوە لە چوارچێوەی کاری 57 کۆمەڵەی تەندروستیی جیهانیدا نەیتوانی ئامانجەکانی خۆی بپێکێت. یەکێک لە ئامانجەکان بریتییە لە پابەندکردنی حکوومەتەکان بەم جێبەجێکردنی بنەماکان لە سەرتاسەری جیهاندا. ئەم دەستپێشخەرییە جیهانیە بوو بە بناغەیەکی بەسوود بۆ دامەزراندنی چەند سیمبولێکی پزیشکیی پرۆفیشناڵانە و داڕشتنی چوارچێوەی یاسایی بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە، بەڵام لە ڕێگەی ئەم بنەمایانەوە نەتوانرا سزای پێویست دابنرێت بۆ دەستەبەرکردنی پابەندێتی و پەیوەستبوون پێیانەوە.

**ڕاگەیاندنی ئیستەنبوڵ**

لە چوارچێوەی ڕاگەیاندنی ئیستەنبوڵ تایبەت بە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و گەشتکردن بە مەبەستی چاندنی ئەندامەکان

لە ژێر چاودێریی کۆمەڵی نێودەوڵەتی بە مەبەستی ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکانی چاندنی ئەندامەکان، پرسی بازرگانیکردنی چاندنی ئەندامانی جەستە، بازرگانیکردن و چاندنی ئەندامەکان لە ڕێگەی گەشتکردنەوە تاووتوێ کرا. ناوەڕۆکی ڕاگەیاندنی ئیستەنبوڵ سەرکۆنەی ئەو کار و کردەوانە دەکات، کە لە سەر بنەمای پێشێلکاری و نەبوونی ویژدان و دادپەروەری و ڕێزگرتن لە شکۆی مرۆڤ سەری هەڵداوە. ئامانجی ئەم ڕاگەیاندنە بریتییە لە پشتیوانیکردنی کار و چالاکییە ئەخلاقییەکانی پەیوەست بە چاندنی ئەندامانی جەستە و بەخشینیان لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی. زیاتر لە 100 ڕێکخراوی تایبەت بە چاندنی ئەندامەکان پشتیوانییان لێ کردوە و لە سەر بنەماکانی ڕاگەیاندنی ئیستەنبوڵ ڕۆیشتوون و کاریان لە سەر کردوە، بە وڵاتانی چین و ئیسرائیل و فلیپین و پاکستانیشەوە، ئەمەیش هۆکارێک بوو بۆ پاڵپشتیکردنی یاساکانیان بۆ وەستان لە دژی بازرگانیکردن و بەدەستهێنانی ئەندامانی جەستە بە ڕێگەی نایاسایی لە دوای دەرچوونی دەقی ڕاگەیاندنی ئیستەنبوڵ.

# کاریگەریی بازرگانیکردنی ئەندامانی جەستە لە سەر هەژاران

## پێکهاتەی دانیشتوان

بە پێی داتا و زانیارییەکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە لە دەوڵەتە تازە پێگەییشتوەکاندا هەژارەکان سەرەکیترین توێژن، کە دەکرێنە ئامانج لە لایەن بازرگانانی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ. لە توێژینەوەیەکدا کە دەربارەی بەخشەرانی ئەندامانی جەستەیان لە هیندستان

ئەنجام دراوە، ڕێژەی 71%ی سەرجەم لایەنە بەخشەرەکان لە خوار هێڵی هەژارییەوە دەژین. چیرۆک و بەسەرهاتەکانی دزینی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ وەک هەمیشە ئەو قوربانییانەی کردوەتە ئامانج، کە بێکار بوون، بە تایبەتی لە ڕەگەزی نێر لە نێوان تەمەنی 20 تا 40 ساڵی، واتە ئەوانەی کە بە دوای کارێکدا عەوداڵن، بەڵام لە کۆتاییدا لە وڵاتێکی تر خۆیان دەبیننەوە و دەبنە نێچیری تۆڕەکان و بازرگانانی نایاسایی و بە ناچاری نەشتەرگەریی دەرهێنانی ئەندامی جەستەیان بۆ دەکرێت. یەکێک لەم چیرۆکانە ژنێک بە ناوی (مارکۆڤا ئیربۆڤا) دەیگێڕێتەوە، کە هاوسەرەکەی بۆ دۆزینەوەی دەرفەتی کار لە ئۆزبەکستانەوە بەرەو کەنەدا کۆچی کردوە، بەڵام دوای چەند ڕۆژێک بۆ خێزانەکەی دەرکەوتوە کە لەگەڵیدا چوون بۆ کەنەدا، کە یەکێک لە ئەندامەکانی جەستەی دەرهێنراوە و زەرفێکیان پێ داوە، کە پێیان وا بوە ئەوە نرخی سەودایەکە بۆ فرۆشتنی ئەو ئەندامەی جەستەی.

پیاوان کەسانێکی دیارن لە بواری بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، بەلام ژن و کچە هەژارەکان زۆرترین قوربانیی ئەم جۆرە بازرگانییەن لە سەر ئاستی جیهان، لەگەڵ ئەمەیشدا زۆرێک لەو داتا و ژمارانەی دەست کەوتوون ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە زۆر بەدەگمەنی ژنان سوودیان لە فرۆشتنی ئەندامەکانی جەستەیان وەرگرتوە.

### هۆکارەکانی بەخشین

یەکێک لەو هۆکارە سەرەکییانەی پاڵ بەو کەسانەوە دەنێت تا ئەندامەکانی جەستەیان بفرۆشن بریتییە لە پێدانەوەی قەرزەکانی سەر ئەستۆیان. گەشتیاران گەشت دەکەن بۆ ولاتە هەژارەکان لە پێناو ئەنجامدانی نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامی جەستەی کەسێکی تر بۆیان لە بەرانبەر پێدانی برێک پارەدا، چونکە دەزانن کە هەندێک لە هەژارەکان زۆر زۆر پێویستیان بە بەدەستهێنانی برێک پارەیە، بۆیە ناچار دەبن تا یەکێک لە ئەندامەکانی جەستەیان بفرۆشن. لە کاتێکدا، هەندێک لە لایەنگرانی بازرگانیکردن

بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دەڵێن ئەم جۆرە مامەڵەیە یارمەتیدەرە بۆ ڕزگارکردنی هەندێک کەس لە داوی هەژاری لە ڕێگەی پێدانی قەرەبوو بۆ هەندێک لایەنی بەخشەری ئەندامانی جەستە. لە زۆرێک حاڵەتدا ئەو کەسانەی، کە ئەندامەکانیان دەفرۆشن لە پێناو پێدانەوەی قەرزەکانیان، ناتوانن لەو قەرزە دەربازیان ببێت، بەڵکوو هەر لە ناو بازنەی قەرزدا دەمێننەوە، چونکە بەو بڕە پارەیە ناتوانن تەواوی قەرزەکانی سەر ئەستۆیان بدەنەوە. لە ڕاستیدا هەندێک جار بەخشەرەکان لە ناخەوە حەز ناکەن گورچیلەکانیان بدەنە کەسانێکی نامۆ، بەڵام هەژاری و نەداری زۆر تەنگی پێهەڵچنیون، بۆیە دوا جار بێچارە دەبن و ئەو کارە دەکەن.

**ئەنجامەکان**

ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی دابەزینی ئاستی خزمەتگوزاریی تەندروستی و خۆشگوزەرانیی ئابووری لە ژیانی ئەو کەسانە نیشان دەدەن، کە لە ڕێگەی نەشتەرگەریی

گەشتیارییەوە ئەندامێکی جەستەیان بەخشیوە و بۆ کەسێکی تر چێنراوە. بۆ نموونە لە ئێران ڕێژەی 58%ی بەخشەرەکان، نەشتەرگەرییەکە کاریگەریی نێگەتیڤی لە سەر تەندروستییان جێ هێشتوە. هەروەها لە میسر ڕێژەی 78%ی بەخشەرەکان بە دەست کێشەی تەندروستیی نەرێنییەوە دەناڵێن، بەڵکوو ڕێژەی 96%ی بەخشەرەکان دواتر لە بڕیاری بەخشینی ئەندامی جەستەیان پاشگەز بوونەتەوە، چونکە زیانی زۆری بۆ تەندروستییان هەبوە.

ئەم ئەنجامانە بە ڕێژەیی لە هەموو وڵاتەکاندا یەک دەگرنەوە. ئەوانەی لە بازاڕدا ئەندامەکانی جەستەیان دەفرۆشن هیچ گرینگی بە تەندروستییان نادەن. بارودۆخی ناتەندروست و گوزەرانی خراپی خەڵک وای کردوە نەشتەرگەرییە پزیشکییەکانی دەرهێنانی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ زۆر ببێت، ئەمەیش بێگومان هۆکارێکە بۆ گواستنەوەی نەخۆشییەکانی وەک هەوکردنی جگەر لە جۆری B و C، بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی جگەر و کەمبوونەوەی بەرگریی لەشی مرۆڤ. دۆخی تەندروستیی خراپی بەخشەران ئاستی خەمۆکی و جۆرەکانی تری نەخۆشییە دەروونییەکان زیاد

دەكات، كە لە ئەنجامی گوشارەكانی بەخشین و كەمیی چاودێریی تەندروستیی پێویست لە پاش نەشتەرگەری سەر هەڵدەدات. توێژینەوەیەک سەبارەت بە بەخشەرانی هیندستان كراوە، دەری دەخات كە ڕێژەی 96%ی بەخشەرەكان گورچیلەیان لە پێناو پێدانەوەی قەرزەكانی سەر ئەستۆیان فرۆشتوە، هەروەها ڕێژەی 75% لە بەخشەرەكان لە لایەن كڕیارانی ئەندامەكانی جەستەیانەوە چاودێری و خزمەت دەكرێن. زۆر جار بەخشەرانی ئەندامانی جەستە لە سەرجەم وڵاتان لە دوای ئەنجامدانی نەشتەرگەریی دەناڵێنن بە دەست خراپبوونی تەندروستیان، كە بە هۆیەوە دەرفەتەكانی كاركردن لە دەست دەدەن، بە تایبەتی سەبارەت بەو كەسانەی، كە بژێوییان لە ڕێگەی هێز و بازووی جەستەییەوە دابین دەكەن.

**گفتوگۆی زانستییانە لە سەر ئەم بازرگانییە نایاساییە**

كێشەی بازرگانیكردنی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، ئەگەر بە شێوەی یاسایی بێت یان نایاسایی، هێشتا بابەتێكی جێمشتومڕی

زۆری نێوان شارەزایان و زاناکانە. ئەم مشتومڕ و گفتوگۆیانە لە جیهاندا زۆرێک دەستپێشخەری و ڕێگەچارەی پێشنیارکراوی لێ کەوتەوە لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەی بەرزبوونەوەی خواست لە سەر ئەندامانی جەستە و بازرگانیکردنی نایاسایی پێیانەوە. دەستپێشخەری و ڕێگەچارە پێشنیارکراوانە بازاڕی ئازادی کڕینوفرۆشتنی ئەندامانی جەستەیشی گرتەوە، لە پاڵ زیاترکردنی ئەو یاسا و ڕێسا و سیستم و سزایانەی، لە دژی بەدەستهێنان و بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە کار دەهێنرێت، جگە لە جیبەجێکردنی یاساکانی تایبەت بە بەخشینی ئەندامانی جەستە. بە شێوەیەکی گشتی کۆمەڵێکی زۆر لە دید و تێڕوانینی ئەکادیمی گفتوگۆیان لە سەر کراوە، کە دەکرێت لەم چەند بوارەی خوارەوەدا ئاماژەیان پێ بکرێت:

1. دید و تێڕوانینی ئەکادیمیستەکان

بە گوێرەی پیاچوونەوەی بەرهەمی فیکری (72) کەس لە توێژەرانی ئابووری، کە

لێکۆڵینەوەیان لە سەر بابەتی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ کردوە، ڕێژەی 68%یـان پشتگیریی بەیاسایـیکردنی ئەم بازرگانییە نایاساییە دەکەن، لە کاتێکدا کە ڕێژەی 21%یـان لە دژی بەیاساییکردنی وەستانەوە.

2. تێڕوانینی دادپەروەری تاوانکاری

سەرەڕای ئەوەی کە زۆرێک لە یاسا پێوەندیدارەکانی بە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بەرکارن، بەڵام یاسا و لێپرسراوەکان لە سەپاندنی ئەم یاسایانەدا شکستیان هێناوە و نەیانتوانی سەرکەوتوو بن لە گەیشتن بە ئامانجە خواستراوەکان. بەربەستێکی تر هەیە بریتییە لە لاوازی هاوپێوەندی لە نێوان دەسەڵاتە تەندروستییەکان و ئاژانسەکانی جێبەجێکردنی یاسا. زۆر جار لێپرسراوانی یاسایی زانیارییان دەست دەکەوێت، کە پەیوەستە بەو کەسانەی تێوەگلاون لە چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە نایاسایی، بەڵام پاراستنی نهێنی پزیشکی لە کاتی نەشتەرگەری و نەبوونی دەسەڵات

بۆ چاوخشاندنەوە بە دۆسییە پزیشکییەکان و بەراوردەکانی ئەنجامدانیان دەبێتە ڕێگر و نامانگەیەنێتە فۆرمۆڵەی کارکردنی جددییانە و کاریگەر لە سەر دۆسیەیەک لە دژی تاوانکاران.

زۆرێک لە ڕەخنەگران هۆشدارییان داوە، کە بۆ ئەوەی دەوڵەت ئاڵوویرکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بە شێوەیەکی نایاسایی بە جۆرێکی کرداریی قەدەغە بکات، پێویستە لە سەر دامودەزگاکانی دادپەروەری تاوانکاریی هاوکاری دامودەزگا و دەسەڵاتە تەندروستییەکان بکەن بۆ زیادکردنی زانیاری و سەپاندنی یاساکانی تایبەت بە بازرگانیکردن. چاودێران و ڕەخنەگران پشتیوانیی ڕێکارەکانی تری دادپەروەری تاوانکارییان کردوە بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە، بۆ نموونە وەک دیاریکردنی ئەولەویاتی دۆسیەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و دانانی ئەم پرسە لە سەرەوەی کاری دەستە و دەزگا یاسادانەرەکان و دەزگا فرە تایبەتمەندییەکان لە ناوخۆدا، هەروەها هاوکاریکردنی پۆلیسی سنور و مەشقپێکردنی

بەردەوام بە هێزەکانی پۆلیس بۆ مامەڵەکردنی دروست لەگەڵ ئەم جۆرە تاوانانە.

3. تێڕوانین لە ڕوانگەی ئابوورییەوە

ڕێژەی 70%ی ئەندامانی کۆمەڵەی ئابووریی ئەمەریکی لە سەر ئەوە کۆکن، کە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ پێویستە پرۆسەیەکی ڕێکخراو بێت، نەک بە نایاسایی ئەنجام بدرێت، بەڵام ڕێژەی 16%یان دژی ئەم پێشنیارەن. لە گۆڤاری (دیدگای ئابووری)دا، براوەی خەڵاتی نۆبڵ «گاری بیکەر» و «خۆلیۆ ئیلیاس» ڕایان گەیاندوە، کە قەرەبووکردنەوەی بەخشەرانی ئەندامەکانی جەستەیان بە بڕی 15000 دۆلار دەبێتە هاندرێک بۆ ئەوەی گورچیلەیان ببەخشن بە کەسانی تر. حکوومەت دەتوانێت بۆ بەدەستهێنانی یەکسانی ئەو بڕە قەرەبوە بدات، ئەمەیش یارمەتیی پاراستنی سامانی گشتی دەدات، چونکە شتنی گورچیلەی نەخۆشەکان، ئەوانەی کە گورچیلەکانیان لە کار کەوتوە، تێچووی لە چاندنی گورچیلە زیاترە.

4. تێڕوانین لە ڕوانگەی ئاکاری پزیشکییەوە

گفتوگۆکردن دەربارەی ئاکار و بەهاکان لە

ئەنجامی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ هێشتا لە ناو کۆمەڵگەی مۆدێرن بوونی هەیە. بە هۆی سروشتی دینامیکیی پێشکەوتنە تەکنۆلۆژییەکان لە بواری پزیشکی و تێگەییشتن لە ئاکاری پزیشکی، ئەو بەڵگە و دۆکیۆمینتانە گۆڕاون کە پێوەندییان بەم بابەتەوە هەیە، تاکو ئەم ساتەوەختەیش سەرەڕای ئەوەی کە بازرگانیکردن بە ئەندامانانی جەستە بە نزیکەیی لە هەموو ولاتانی جیهاندا نایاساییە، بەڵام هێشتا قورسە کۆتاییەکی بەهێز لە بواری ئاکارەکانی کارکردندا دەستەبەر بکرێت بە بێ لایەنگیریکردن لە سەر بنەمای بیر و ڕا، یان کەلتوور و پەیوەستی دینی، بە تایبەتی ئەوانەی کە ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕن لە بابەتی سەربەخۆیی جەستەیی لە ڕوانگەی پێوەندیی بە بازرگانیکردن بە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ. سەربەخۆیی جەستەیی گرینگە بەو پێیەی کە توانای هەیە بۆ دەستنیشانکردنی بژاردەکان، کە چۆن پێویستە مامەڵە لەگەڵ جەستەدا بکرێت لە لایەن کەسانی ترەوە. زۆرێک لە چالاکان و کەسایەتییە دینییەکان و تیۆرسێنان دەڵێن: بیرۆکەی

سەربەخۆیی جەستەیی وەک خاوەندارێتییەکی تایبەتی مامەڵە لەگەڵ جەستەدا دەکات، ئەمەیش بەشێکی زۆر لە بیر و ڕا دینییەکان پێشێل دەکات لەو ڕوانگەیەوە کە جەستە و دەروون یەک پێکهاتەن. لەبەر ئەمەیە کە زۆرێک لە دیدگا و هەڵوێستە دینییەکان پێیان وایە فرۆشتنی بەشێکی جەستە یان لەش هاوتایە لەگەڵ ناوەرۆکی تایبەت بە ناخی مرۆڤ یان ڕۆح، بەڵام لە ڕوانگەی تێڕوانینی زۆرێک لە تائیفە و پێکهاتە دینییەکانەوە ئەم بابەتە بە پێشێلکردنی شکۆی مرۆڤ دەدرێتە قەڵەم. هەندێک لە توێژەران باسی ئەوەیان کردوە، کە بەیاساییکردنی ئەم بابەتە بۆی هەیە ڕێگە بۆ دەوڵەت خۆش بکات تا خۆی سەرپەرشتیی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بکات، بەم پێیەش لە ئاستی مەترسییە پزیشکییەکان و ئیستیغلالکردن کەم دەکاتەوە. ئەم هەنگاوە دەکرێت یارمەتیدەر بێت بۆ پارێزگاریکردن لە بەخشەرانی ئەندامانی جەستە لە ناو بازاڕی ڕەش، چونکە زۆر جار ئەو بەخشەرانە هاوکاری و چاودێریی پێویست بە دەست ناهێنن لە دوای ئەندجامدانی

نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامی جەستەیان بۆ کەسانێکی تر.

5. تێڕوانین لە ڕوانگەی مافەکانی مرۆڤەوە

کۆمەڵێکی فرەجۆری گروپەکانی داکۆکیکار لە مافەکانی مرۆڤ دژایەتیی بەیاساییکردنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دەکەن. دەزگای ئەنترۆپۆلۆژیی پزیشکی (وۆچ) کە نانسی شیپەر هیوز دای مەزراندوە ڕۆڵی کارای هەیە لە ئاشکراکردن و ئابڕووبردنی بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ. شیپر هیوز بە لێکۆڵینەوەکانی ناوبانگی دەرکــردوە، کە بـوەتـە هـۆی دەستگیرکردنی زۆرێـک کـەس لـە دەوڵـەتـانـی جیهانی سـێ و بەرگری لە کەسە هەژارە و ناچارکراوەکان و هەڵخەڵەتێنراوەکان کردوە لە کاتی بەخشینی ئەندامەکانی جەستەیان.

دەزگـای ئەنترۆپۆلۆژیی پزیشکی (وۆچ) وەک ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی هەوڵ دەدات بۆ پارێزگاریکردن لەو مرۆڤانەی کە بە دەست هەژاری و خراپیی بژێوییەوە دەناڵێنن و بەشدارن لە بازرگانیی نایاسایی بە ئەندامانی

جەستەی مرۆڤ، کە بە سەریاندا سەپێنراوە.
لە ساڵی 2010دا شیپەر هیوز و چاودێرانی بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستە کاریان کرد لە سەر قەرەبووکردنەوەی بەخشەرانی ئەندامانی جەستەیان بە شێوەیەکی یاسایی.

## ڕێگەچارە پێشنیارکراوەکان

کۆمەڵێک ڕێگەچارەی پێشنیارکراو هەیە بۆ زیادکردنی ژمارەی ئەو ئەندامانەی جەستەی مرۆڤ تا بە شێوەیەکی یاسایی بەردەست بێت بۆ سنورێک دابنرێت بۆ زیادبوونی بازرگانیکردنی نایاسایی لە هەموو وڵاتانی جیهاندا. ئەو سیاسەتانەی کەوا پێویستە ڕەزامەندییان لە سەر بدرێت لە زۆرێک وڵاتی جیهاندا سەرکەوتنی بە دەست هێناوە، بۆ نموونە لە بەرازیل و ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا و چەندین دەوڵەتی ئەورووپا. ئەم سیاسەتانە دەکرێت یان پابەند بکرێت (لە ماوەی ژیان) یان لێیان دەستبەردار ببن (لە دوای مردن). ئەو توێژەی کە پابەندی سیاسەتی دەستبەرداربوونە،

لەوانەیە لە دوای مردن ئەندامەکانی جەستەیان ببەخشرێت بە کەسانی تر، سەرەڕای ئەگەری ئەوەی کە مرۆڤ لە ڕێگەی پێشکەشکردنی دۆکیۆمێنتەکانەوە ڕێگەی بەخشین هەڵبژێرێت. توێژینەوەکان نیشانیان داوە، نزیکەی 25 تا 30%ی ئەو ئەندامانەی جەستەی مرۆڤ، کە دەست کەوتوە لەو وڵاتانەدایە، کە پابەندی سیاسەتی سنوردارکردنن، بەڵام ئەو وڵاتانەی کە بە زۆری پابەندی سیاسەتی پابەندکردنن وەک ویلایەتە یەکگرتوەکان و فەڕەنسا، پێدەچێت کەسەکە تا لە ژیانە ئەندامێکی جەستەی خۆی بە کەسێکی تر ببەخشێت. بەرنامەی کەمکردنەوەی ئاستی بازرگانیکردن بە ئەندامی جەستەی مرۆڤ زۆرێک ڕێگەی پێشنیار کردوە بە شێوازی یاسایی. ئەم یاسایانە یارمەتیدەرن لە زیادکردنی بڕی ئەو ئەندامانەی ئامادە دەکرێت، بەڵکوو هۆکارێکە بۆ دوورخستنەوەی نەخۆشەکان و پەنابەران لە بازاڕی ڕەش. لە هەمان کاتدا زیادبوونی ئەندامانی جەستەی بەردەست و خراوەڕوو، تێچوونی دارایی نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامەکان کەم دەکاتەوە،

بەو شێوەیەیش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی پێویستی بە گەشتکردنی پزیشکی بە مەبەستی چاندنی ئەندامی جەستە.

ڕێگەیەکی تری پێشنیارکراو بریتییە لە دارشتنی ئەو یاسایانەی، کە دەبێتە هۆی قورسترکردنی بەرپرسیارێتیی پزیشکەکان کاتێک ئاگاداری نادەن دەربارەی ئەو کەسانەی گومان دەکرێت بازرگانی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤەوە بکەن. شیپەر هیوز بە شێوەیەکی بەرفراوان دەربارەی کەیسی ئەو پزیشکانە نووسیویەتی، کە هەڵساون بە ئەنجامدانی نەشتەرگەریی نایاسایی، هەر چەندە زانیویانە کە کارەکە نایاسایی و ڕێگەپێنەدراوە.

بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ یەکێکە لەو بازرگانییانەی، کە لە هەموو جیهاندا زۆر بە نهێنی و شاراوەیی ئەنجام دەدرێت، بەڵام دەرچواندنی یاسایەکی تایبەت بەم بازرگانییە لە میسر مشتومڕی زۆری دروست کردوە. پەرلەمانتارێکی ئەو وڵاتە (8) زانیاریی مەترسیداری لە بارەی ئەم بازرگانییە نایاساییە ئاشکرا کردوە و لە ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییە

نێودەوڵەتییەکاندا ئاماژەیان پێ کراوە، کە لێرەدا دەیانخەینە ڕوو:

1. دەوڵەتی ئیسرائیل یەکێکە لەو دەوڵەتانەی، کە زۆرترین نێوەندکار و دەڵاڵەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دەحەوێنێتەوە.

2. شانشینی عەرەبستانی سعوودیە دەوڵەتی پلە یەکەمە لە هاوردەکردنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، ئەمە لە کاتێکدایە کە میسر پلەی یەکەمی لیستی ئەو دەوڵەتانەی گرتوە کە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بۆ دەرەوە هەناردە دەکەن، ئەمەیش بە پێی لێکۆڵینەوەیەک کە پێگەی تەلەفیزیۆنی (نابلس) دەربارەی بازرگانیکردنی بە ئەندامانی جەستە بڵاوی کردوەتەوە.

3. دیارترین و بەناوبانگترین نێوەندگیر و دەڵاڵەکانی ئەم بازرگانییە هاوڵاتییەکی ئیسرائیلییە بە ناوی (موشیە هارئێل)، کە خاوەنی ڕەگەزنامەی تورکییشە.

4. ئێران تەنها دەوڵەتە لە هەموو جیهاندا، کە ڕێگەی داوە بە بەخشینی ئەندامانی جەستە لە بەرانبەر بەدەستهێنانی پارەدا.

5. بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بەم دواییە گەشەی کردوە بە هۆی کاریگەریی قەیرانی ئابووریی جیهانەوە.

6. بەشێکی زۆر لە بەخشەرانی ئەندامانی جەستە هیی هەژارەکانن و لە ناو جەستەی دەوڵەمەندەکاندا دەچێنرێت، بە تایبەتی لە تورکیا و مۆڵدۆڤیا و ئیسرائیل.

7. نرخی یەک گورچیلە بۆ نموونە 160 هەزار یۆرۆیە و تێچوەکانی گواستنەوە و پاراستن و خەرجییەکانی تریش دەگرێتەوە، کە کەسی بەخشەر تەنها 750 یۆرۆی لەو برە پارەیە دەست دەکەوێت، بەڵکوو هەندێکیان تووشی فێڵکردن و هەڵخەڵەتاندن دەبن.

8. بە پێی ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان ساڵانە لە ئەورووپا 10 هەزار نەشتەرگەریی چاندنی گورچیلە ئەنجام دەدرێت.

9. لە کیشوەری ئەورووپایش 40 هەزار نەخۆش چاوەڕوانی نۆرەی خۆیانن بۆ بەدەستهێنانی گورچیلەیەکی تازە.

10. لە میسر بازرگانیکردن و دزینی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بەربڵاوە، بەڵام بە پێی یاسا تاوانە.

میسر پلەی سێیەمی لە سەر ئاستی جیهان و پلەی یەکەمی لە سەر ئاستی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست گرتوە لە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، ئەوەیش بە پێی توێژینەوەیەکی نوێ، کە لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانییەوە دەرچووە. ئەو توێژینەوەیە هۆکاری گەشەسەندنی ئەم جۆرە بازرگانییە نایاساییە دەگێڕێتەوە بۆ بارودۆخی هەژاری و سەختیی بژێوی و خراپیی باری ئابووری، کە بەشێکی زۆری دانیشتوانی میسر پێوەی دەناڵێنن.

ڕۆڵی باند و مافیاکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە دەوڵەتانی جیهان، بە تایبەتی لە دەوڵەتە هەرێمییەکان بەرەو هەڵکشانە، ئەمەیش بەڕوونی لە وڵاتانی میسر، لیبیا، سوودان، مەغریب، جەزائیر، یەمەن، لوبنان، سووریا، ئوردوون، عێراق و تورکیا دەرکەوتوە و ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ لە بازاڕی ڕەش کڕینوفرۆشتنیان پێوە دەکرێت، بە تایبەتی کە ئەم وڵاتانانە لە ڕێگەی چەند دامودەزگایەکەوە دەستیان لەگەڵ مافیا

تاوانکارەکاندا تێکەڵ کردوە، بە جۆرێک کە ئەم تۆڕە مامۆستایانی زانکۆ و ئەندامانی سەر بە دەستەی برینپێچی و کەسانی خاوەن پێگەوپایە و تاقیگە پزیشکییەکان و نێوەندگیر و دەڵاڵەکان و کەسانی خاوەن ڕابردووی خراپ دەگرێتە خۆ. ئەم بازرگانییە پرۆسەیەکی سنوربەزێنە، بە تایبەتی لە سایەی بارودۆخی ئابووری و ئەمنیی ناسەقامگیر و بەردەوامی ئەو ناکۆکی و ململانێ ناوخۆییانەی، کە ئەو وڵاتانەی پێدا تێدەپەڕێت، هاوکات لەگەڵ زیادبوونی پێویستی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان بە دەستکەوتنی سەرچاوەی دارایی و کاریگەریی چەندین فاکتەری تری پەیوەست بە گوشارەکانی باری ئابووری و زۆریی ئەو قازانجە داراییەی، کە لە ڕێگەی بازرگانیی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دەست دەکەوێت لە پاڵ نەبوونی یاسای تۆکمە تا بەرانبەر ئەم بازرگانییە نایاساییە بوەستێتەوە.

لە دەوڵەتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دەگوترێت «تاوانی بێدەنگ»، چونکە دوور لە

بازنەی چاودێریکردن و لێپێچینەوە ئەنجام دەدرێت. ئێران بە تەنها دەوڵەتی جیهان دادەنرێت کە ڕێگەی داوە بە بەخشینی ئەندامانی جەستەی مرۆڤێکی زیندوو لە بەرانبەر بڕێک پارەدا، کە بە گشتی دەگاتە 300 جونەیهی ئیستەرلینی، بەم شێوەیەیش دەبێتە بازرگانییەکی بەیاساییکراو، لە کاتێکدا ئەم شێوازە لە دەوڵەتانی تری جیهان پەیڕەو ناکرێت بە جۆرێک کە بازاڕی ڕەش بڕەخسێنێت بۆ بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە. هیچ داتا و ئامارێکی فەرمی سەبارەت بە قەبارەی بازرگانی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە نەخۆشخانە گشتییەکان یان لە دەزگا تەندروستییە تایبەتییەکان لە بەر دەستدا نییە، بەڵام نەبوونی داتا و بەڵگە مانای ئەوە نییە، کە بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ بوونی نییە، چونکە ئەو نهێنییەی کە ڕاستیی ئەم کارە نەبینراوەی داپۆشیوە، وای کردوە دیاریکردنی قەبارەی ئەم بازاڕە ڕەشە و ژمارەی ئەو کەسانەی سالانە بە شێوەیەکی نایاسایی لە هەموو جیهان کاری تێدا دەکەن، قورس بێت، لەگەڵ هەبوونی جیاوازی لە نرخەکاندا

لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر. بە پێی ئەو ئامارانەی ساڵی 2015 لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانییەوە، ساڵانە زیاتر لە 10 هەزار نەشتەرگەریی کڕینوفرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ ئەنجام دراوە و ڕێژەی 5 تا 10%ی هەموو نەشتەرگەرییەکانی چاندنی گورچیلە لە سەر ئاستی جیهان لە ڕێگەی بازرگانیکردنی نایاسایی و ئاودیوکردن لە ڕێگەی سنورەکانەوە ئەنجام دراوە، لە کاتێکدا بە گوێرەی هەندێک داتا و ئاماری تر داهاتی ساڵانەی ئەم بازرگانیکردنە 8 ملیار دۆلار زیاترە.

گەشەکردنی بازاڕی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بۆ کۆمەڵێک فاکتەر دەگەڕێتەوە، کە ئەمانەن:

1. زۆربوونی ژمارەی باند و دەڵاڵەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، کە بە «تۆڕی مردن» ناسراون.

2. کاریگەریی هەڵکشانی قەبارەی کێشە و ململانێ ناوخۆییەکان و پێکدادانە چەکدارییەکان، ئەمەیش بە ڕوونی لە سەر سنورەکانی نێوان

تورکیا – سووریا، عێراق – سووریا، عێراق – تورکیا، لوبنان – سووریا، سووریا – ئوردوون بەرجەستە بوە و کۆمەڵێک باند و گروپی جۆراوجۆر پەیدا بوو، کە بەرژەوەندییان هەیە و لە بواری بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ چالاک بوون، بە تایبەتی لە سەر سنورەکانی سووریا.

لە لێدوانێکی دکتۆر حسێن نۆفەل، سەرۆکی بەشی پزیشکیی دادوەری زانکۆی دیمەشق و سەرۆکی دەستەی گشتیی پزیشکی دادوەری بۆ ڕاگەیاندنەکان لە ساڵی 2016: لە سەرەتای دەستپێکردنی شەڕی سووریاوە نزیکەی 20 هەزار نەشتەرگەریی چاندنی ئەندامانی جەستە ئەنجام دراوە، بە تایبەتیش لەو ناوچانەی کە دوورن لە چاودێریکردن و لێپرسینەوەی فەرمی. نۆفەل گوتیشی: «زۆربەی ئەم نەشتەرگەرییانە لە ناو کەمپەکانی پەنابەریێتی لە لوبنان و تورکیا و هەندێک دەوڵەتانی دراوسێی سووریا ئەنجام دراوە».

3. هەبوونی جوگرافیایەکی کراوە و ئاسان بۆ ئەنجامدانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی

جەستەی مرۆڤ لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقیا، بە تایبەتی لە دوای ڕووخانی هەندێک لە ڕژێمە عەرەبییەکان و لاوازبوونی حکوومەتە ناوەندییەکان لە دوای شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی، ئەمەیش ڕێگەی خۆش کرد بۆ هەڵکەوتنی کۆمەڵێک تاقم و گرووپی لە یاسا دەرچوو، لە پێش هەموویشیانەوە گرووپە چەکدارە سنووربڕەکان، کە بوونەتە سەرچاوەی بەقاچاغبردن و بازرگانیی نایاسایی لە هەرێمەکەدا، لە پێشەنگی هەموویشیان ڕێکخراوەکانی تایبەتمەند لە بواری بازرگانیکردن بە ماددە هۆشبەرەکان دێت.

بۆ نموونە، مافیای مەغریبی دەستی گرتوە بە سەر بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە لە باکووری ئەفریقیا لە ڕێگەی ڕێڕەوە سەرەکییەکەی لە گەرووی جەبەل تاریق، هەروەها چەند بنکەیەکی لە سەر سنووری نێوان مەغریب و تونس و جەزائیر هەیە و دەریای کردوەتە ڕێگەیەکی گونجاو بۆ بەقاچاغبردنی هەر شتێک بیەوێت. پۆلیسی

سەربازیی جەزائیری پێش 3 ساڵ لەمەوبەر تۆڕێکی بازرگانیکردنی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ هەڵوەشاندەوە لە نێوان جەزائیر و مەغریب کاری دەکرد و لە لایەن مامۆستایەکی زانکۆوە بەڕێوە دەبرا. هەروەها مافیای لوبنانی کارەکانی لە بواری بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە ناوچەکانی باشوور و بیقاع و باکووری لوبنان ئەنجام دەدات، چونکە ئەو ناوچانە بۆ گەنجانی بێکار هاندەرە بۆ تێوەگلانیان لەم بازرگانییە، هەر چەندە بە هۆی بەردەوامیی ململانێکانەوە ڕووبەڕووی مردنیان دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی کە ئەندامەکانی ئەم تۆڕە لە ڕێگەی شاری (صور)ی باشوور بەرەو دیمەشق و لەوێیشەوە بەرەو تورکیا و ڕۆمانیا هاتوچۆ دەکەن.

چەندین تۆڕ و باندی تریش لە سووریا بوونیان هەیە، کە مامەڵە لەگەڵ باندە عەرەبی و نێودەوڵەتییەکاندا دەکەن لە بواری بازرگانیکردن بە گلێنەی چاو، ئەم باندانە لە دیمەشقەوە ئەندامەکانی جەستە دەگەیەننە هەندێک دەوڵەتی ئەورووپا و ئاسیا. هەروەها

بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە هەرێمی کوردستان سەری هەڵداوە، بە تایبەتی لە ناو ئاوارەکاندا، کە لە هەرێمەکە دەژیـن، هــەروەک لـە چەند ناوچەیەکی تری عێراق گەشەی کردوە بە هۆی بەردەوامی شەڕ و پێکدادانە چەکدارییەکان و تەقینەوەکانەوە، کە بە هۆیانەوە سەدان کەس دەبنە قوربانی، ئـەمـەیش یـارمـەتـیـدەرە بـۆ گـەشـەسـەنـدنـی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، چونکە ئەم تۆڕ و مافیایانە کەڵک لە ئەندامەکانی جەستەی قوربانییە نەناسراوەکان وەردەگرن، کە دەبرێنە پەیمانگای پزیشکی دادوەری بۆ توێکاری.

4. بازرگانیکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مـرۆڤ بوەتە یەکێک لە سـەرچاوە داراییـیـەکـانـی بـۆ ڕێـکـخـراوە تیرۆریستی و توندڕەوەکان. چەکدارانی سەر بە ڕێکخراوی تـیـرۆریـسـتـیـی داعــش بـە هــاوکــاری لـەگـەڵ هەندێک لە تاقم و گروپە بەرژەوەندیخوازەکان لـە هەندێک وڵاتـی وەک تورکیا و سووریا هـەڵـدەسـتـن بـە دابـیـنـکـردنـی ئـەنـدامـەکـانـی

جەستەی مرۆڤ بە کوالیتی و بڕی دیاریکراو، هەروەها ئەندامانی داعش هەڵدەستن بە لێکردنەوە و دەرهێنانی ئەو ئەندامانەی لە جەستەی ئەوانەی بە دیل دەگیرێن یان لە لاشەی ئەو کوژراوو بریندارانەی، کە لە شەڕ و ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکاندا دەبنە قوربانی، یان لە جەستەی چەکدارە کوژراوەکانی خۆیان دەریان دەهێنن، بە تایبەتی لە دوای زۆربوونی گورزە کوشندەکانی هاوپەیمانێتیی نێودەوڵەتی دژ بە داعش لە بەرەکانی شەڕدا.

ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە ناو بازاڕی ڕەش دەفرۆشرێن، بە تایبەتی لە دوای کەمبوونەوەی سەرچاوە داراییەکانی، کە لە ئەنجامی دەرهێنانی نەوت دەست ڕێکخراوی داعش دەکەوت. کارەکانی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دوای هێرشێکی ئاسمانی هێزەکانی هاوپەیمانێتیی نێودەوڵەتی بۆ سەر ناوەندێکی دۆکیۆمێنت و فەتواکانی ڕێکخراوی داعش زیاتر ئاشکرا بوو، کە ئەو فەتوایانە ڕێگەیان بە دەرهێنانی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ داوە.

هەر چەندە بە گوێرەی زانیارییەکان، داعش ئەو فەتوایەی بۆ هاوکاریکردنی چەکدارە بریندارەکانی خۆیان دەرکردوە، بەڵام فەتواکە بوەتە نیگەرانیی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و ڕێگا بۆ بازرگانیکردن بە جەستەی مرۆڤەوە خۆشتر دەکات. لە ناوەڕۆکی فەتواکەی داعشدا داهاتوە: «پاراستنی گیانی کافر لە بەرانبەر پاراستنی گیانی موسوڵماندا هیچ بەهای نییە، تەنانەت ئەگەر جیاکردنەوەی ئەندامی لەشی کافرێک ببێتە هۆی گیانلەدەستدانیشی، مادام لە پێناو پاراستنی گیانی موسوڵمانێکدایە بایەخی نییە». پێشتر حکوومەتی عێراق ڕای گەیاندبوو، داعش لەگەڵ باندەکانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە پێوەندیدایە، بەڵام ناوەندەکانی داکۆکیکار لە مافی مرۆڤ هەڵوێستێکی ئەوتۆیان نەبوو.

محەمە عەلی ئەلحەکیم، باڵیۆزی عێراق لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لە وتارێکیدا لە بەردەم ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لە 18ی شوباتی 2015 ڕای گەیاند: «ڕێکخراوی داعش بازرگانیکردنی بە ئەندامانی جەستەی

مرۆڤ کردوەتە یەکێک لە سەرچاوە داراییەکانی لە عێراق، هەروەها ئەو پزیشکانەی کوشتوە کە ئامادە نەبوون کاری بۆ بکەن». حکوومەتی عێراق بەردەوام ڕادێری پێوەندییەکانی نێوان ئەندامانی ڕێکخراوی داعشی کردوە، کە تێیدا داوای بەدەستهێنانی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ کراوە، هەندێک تەرمیش بەشێوێنراوی دۆزرانەوە کە ئەندامەکانیان لێ دەرهێنراوە.

5. هەڵکشان و زۆربوونی قەیرانی ئابوورییەکان و خراپیی بژێویی خەڵک یەکێکی تری لە هۆکارە سەرەکییەکان بۆ گەشەکردنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە ناو کۆمەڵگەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، بە تایبەتی وڵاتە هەژارەکان، کە بە هۆی زیادبوونی ڕێژەی بێکاری و بڵاوبوونەوەی برسێتی و کۆنترۆڵنەکردنی کێشە و گرفتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانەوە بوونەتە ژینگەیەکی گونجاو بۆ گەشەکردنی ئەم جۆرە بازرگانییە نایاساییە، بە جۆرێک کە هەندێک کەس ناچار بوون لە بەرانبەر بەدەستهێنانی بڕێک پارەی کەم بۆ ئەوەی بژێویی خۆیان و خێزانەکانیان

پێ دابین بکەن، یەکێک لە ئەندامانی جەستە خۆیان دەفرۆشن.

6. لاوازیــی ئــەو یاسـا و ڕێسـایانـەی کە پرۆســەی گواستنەوەی ئەندامانی جەستەی مـرۆڤ ڕێـک دەخـات لـە زۆربــەی دەوڵەتانی ناوچەکە، ئەمەیش بە هۆی نەبوون یان لاوازیی دەقی یاسایی تایبەت بە کۆنترۆڵکردنی تاوانی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، لەبەر ئەوە کارەکانی کڕینوفرۆشتن و چاندن لە کەسی بەخشەرەوە بۆ نەخۆش پرۆسەیەکە لە پشت پـەردەوە بـەڕێوە دەبرێت، بە هۆی ئەو هەموو سەرپێچییە یاسایی و مەترسییە تەندروستییانەوە، کە بەخشینی ئەندامی جەستە لێی دەکەوێتەوە.

بـۆ نـمـوونـە، یـاسـای یـەمـەن تـاوانـی بازرگانیکردنی بە ئەندامانی جەستە بە تاوان دانـەنـاوە، ئەمەیش دادوەرانــی ناچار کردوە فرۆشیارانی گورچیلە بە بێ سزا ئازاد بکەن. حکوومەتی یەمەن لە ساڵی 2012دا بۆ یەکەم جار دانی بە هەبوونی دیاردەی بازرگانیکردن بە ئەندامی جەستەی مرۆڤدا ناوە، دوای ئەوە

باندەکان هەستان بە بردنی هاوڵاتییانی یەمەن بۆ وڵاتی میسر بە مەبەستی بازرگانیکردنی بە ئەندامەکانی جەستەیان، سەبارەت بە عێراقییش بە هەمان شێوەیە.

7. لاوازی و سنورداری ڕۆڵی دەزگاکانی چاودێریکردنی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستە لە لایەن حکوومەتەوە، ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی چاودێرییەکی توند لە ناو نەخۆشخانەکاندا، لە کاتێکدا نەشتەرگەرییەکان بە پێی بنەمای کەسێکی نەخۆش و کەسێکی بەخشەری ئەندامی جەستە بەڕێوە دەچێت، ئەمە جگە لە لاوازی یان نەبوونی چاودێریکردنی ئەمنیی لە لایەن دامودەزگا تایبەتمەندەکان لە زۆربەی وڵاتەکاندا. بۆ نموونە لە سووریا بە ئاشکرا ئەم بازرگانیکردنە بوونی هەیە و ڕیکلام و پۆستەری لە شەقامەکان و لە بەردەم دامودەزگا حکومییەکاندا بۆ ئەم مەبەستە هەڵواسراوە، ئامانجەکەیش ئەوەیە کە بەشێکی زۆر لە هاوڵاتییان ڕیکلامەکان ببینن بە بێ هیچ لێپێچینەوە و چاودێریکردنێک.

8. کاریگەریتیی گروپە بەرژەوەندخوازە نێودەوڵەتییەکان: ڕاپۆرتێکی پەرلەمانی ئەورووپا، کە لە ساڵی 2015دا دەرچوە هۆشداریی داوە سەبارەت بە ڕۆڵی دەوڵەمەندەکانی دەوڵەتانی ئەورووپا، بە تایبەتی لە دەوڵەتانی خۆرهەلاتی ئەورووپا و کۆسۆڤۆ و بەلکان، لە ڕووی کارئاسانیکردنی و ڕەواجپێدانی ئەم بازرگانییە. سەرەڕای ئەوەی کە سەرچاوەکەی کەسانێکن لە دەوڵەتانی ئەفریقیا و ئاسیاوە دەهێنرێن (بە تایبەتی چین و هیندستان و پاکستان)، بەلام بازرگانییەکە لە ناو ئەورووپا گەشە دەکات، لە پاڵ بەهەندوەرگرتنی گەشتیاری بۆ چاندنی ئەندامی جەستە، کە ژمارەیەکی زۆر لە نەخۆشانی دەوڵەمەندی تونسی کەلکی لێ وەردەگرن، ئەوانەی کە ڕوو دەکەنە دەوڵەتانی ئەورووپا بە مەبەستی کڕینی ئەندامانی جەستە و چاندنی. لە کاتێکدا میسر بە یەکێک لەو ولاتانە دادەنرێت، کە گەشتیاریی چاندنی ئەندامەکانی تێدا بلاوە بە هۆی هاتنی بە لێشاوی بیانییەکانەوە بە مەبەستی ئەنجامدانی چاندنی ئەندامانی جەستە لە دوای کڕینی لە

ڕێگەی نێوەندگیرەکان و دەڵاڵەکانەوە.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، چیرۆکی نوێی ئەشکەنجەدانی ژمارەیەک زیندانی گرتووخانەکانی ڕژێمی سووریا ئاشکرا دەبێت، زۆرێک لەو زیندانییانەیش، تەنها تاوانیان ئەوەیە یان لە ناوچەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی ڕژێمی سووری بوون، یان خزمایەتی و پێوەندییان لەگەڵ یەکێک لە داوکراوەکاندا هەیە. زانیاری و وێنە دزەپێکراوەکانی ناو گرتووخانەکانی ڕژێمی سووریا و زانیارییەکانی کە بە هۆی مانگە دەستکردەکانەوە لە سەر گۆڕە بە کۆمەڵەکان دەست کەوتوون، لەگەڵ شایەتیدانی ئەو کەسانەی پێشتر لە یەکێک لە زیندانەکانی ڕژێمی سووریا زیندانی کرابوون، چیرۆکی ترسناک و تۆقێنەریان ئاشکرا کردوە و دەیسەلمێنن ئەو گرتووخانانە پڕن لە تاوانی گەورە و دۆخەکە بە شێوەیەکە، ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ بە «سەربڕخانەی مرۆیی» ناوی دەبەن.

محەمەد یوونس، زیندانییەکی پێشووی گرتووخانەی «سیدنایا»ی ناودار بوە لە

نزیک دیمەشق، لەو شوێنەدا ئەندامانی سەر بە ڕژێمی سووریا، تۆڵە لە جەستە و عەقڵی دەستگیرکراوەکان دەسێننەوە، بە ڕێگایەک کە زۆر کەس ناتوانن پێشبینی بکەن، لە «کورسیی مۆم» و شکاندنی پشت جگە لە شکاندنی باڵ و قاچ و و ئەندامانی تری جەستە و تەنانەت زمان و کۆئەندامی هەناسەدانیان تا دەرهێنانی گورچیلەکانیان، بە شێوازی جۆراوجۆر ئەشکەنجە دەیانگرێتەوە و شوێنەوارێکی وەها لە سەر زیندانییەکان جێ دەهێڵێت، کە هەندێکیان تا مردن بە دەستییەوە دەناڵێنن.

## فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە هەرێمی کوردستان بەیاسایی دەکرێت

ڕێکخراوێکی ئەمەریکی کە لە کوردستان و بە تایبەت لە ناو کەمپی ئاوارەکان کار دەکات، ڕای دەگەیێنێت «بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و لەشفرۆشی ڕووی لە زیادبوون کردوە، بە تایبەتی لە ناو کەمپی ئاوارەکاندا لە سەرەتای ساڵی 2016 زۆرترین کڕینوفرۆشتن بە گورچیلەوە کراوە، نرخەکەیشی لە نێوان 7 تا 12 هەزار دۆلاردا بوە.

بە پێی ڕاگەیێنراوێکی وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی هەرێمی کوردستان، د.یووسف گۆران، وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی لە کۆبوونەوەیەکدا لەگەڵ شاندێکی ڕێکخراوی (هارتلاند ئەلاینس)ی ئەمەریکی، مەیس مەساعدی، بەڕێوەبەری پرۆژەکانی ئەو ڕێکخراوە لە هەرێمی کوردستان باسی لەوە کردوە، بە هۆی زۆری ژمارەی ئاوارەکانەوە لە کەمپەکاندا بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و لەشفرۆشی ڕووی لە زیادبوون کردوە.

مەساعدی لەو کۆبوونەوەیەدا گوتوویەتی: «بە تایبەتی لە ناو کەمپی ئاوارەکاندا زۆرترین کڕینوفرۆشتن بە گورچیلەوە کراوە، ئەوە لە کاتێکدایە کە بە پێی یاساکان بەخشینی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دەبێت بێبەرانبەر بێت بۆ کەسانێک لە هەمان خێزان بن». جێی ئاماژەیە یەکێک لە کەناڵە میدیاییەکانی هەرێمی کوردستان لە بەدواداچوونێکی ڕۆژنامەوانیدا بابەتی بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، بە تایبەتی گورچیلەی لە باشووری

کوردستان ئاشکرا کردبوو، ئەوەیشی خستوەتە ڕوو، کە ئەو مامەڵەیە لە ناو ژمارەیەک نەخۆشخانەی ئەهلیدا ئەنجام دراوە.

لە دوای زیادبوونی دەنگۆی هەبوونی ئەم جۆرە بازرگانییە لە هەرێمی کوردستان، پەرلەمانی کوردستان لە ڕێگەی پڕۆژە یاسایەکەوە هەوڵ دەدات بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە هەرێمی کوردستان قەدەغە بکات و پەرلەمانتارێکیش ناوەڕۆکی پڕۆژە یاساکەی بۆ ڕای گشتیی ئاشکرا کرد، بە تایبەتی سەبارەت بە بەخشینی ئەندامانی جەستە لە دوای مردن، ڕایشی گەیاندوە کە پڕۆژە یاساکە لە پەرلەمان تاووتوێ کراوە و دەنگی لە سەر دەدرێت.

بەپێی تۆڕی هەواڵی سلێمانی SNN، "بەشێکی زۆری ماددە و بڕگەکانی پڕۆژە یاسای چاندن و گواستنەوەی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ پەسەند کراوە، بەڵام ئەو بڕگانەی، کە پێوەندییان بە سزاکانەوە هەیە دوا خراوە. یەکێک لە بابەتە گرینگەکانی ئەو پڕۆژە یاسایە بریتییە لە پرسی فرۆشتنی گورچیلەی مرۆڤ لە هەرێم. بە گوێرەی ئەم پڕۆژە یاسایە هەم

نەخۆشخانەی تایبەت بە چاندن و گواستنەوەی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ دادەنرێت، هەمیش بازرگانیکردن بە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ بە یاسا قەدەغە دەکرێت.

بە وتەی ئەو پەرلەمانتارە، نەخۆشخانەی تایبەت بەو پرسە دادەنرێت و لە لایەن تیمی پزیشکی تایبەتەوە ئەندامی لەشی کەسی خۆبەخش وەردەگیرێت و دواتر دەخرێتە جەستەی کەسی نەخۆشەوە، کە دەبێت ڕەزامەندیی خۆی تێدا بێت. پێشتر کاری بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە هەرێمی کوردستاندا کراوە، بەڵام بە گوێرەی پڕۆژە یاساکە تا ڕادەیەکی زۆر ئەو بازرگانییە کەم دەبێتەوە و ڕێگریی لێ دەکرێت. هەر بە گوێرەی پڕۆژە یاساکە، شوێنێکی تایبەت دادەنرێت بۆ ئەو کەسانەی، کە لە دوای کۆچکردنیان ئەندامانی جەستەی خۆیان دەبەخشن و ڕەزامەندیی خۆیان و کەسوکاریان وەردەگیرێت و دواتر ناسنامەیەکیان بۆ دروست دەکرێت، کە بەردەوام پێیان دەبێت، وەک بەڵگەیەک بۆ بەخشینی جەستەی کەسە کۆچکردوەکە.

**ئەو سەرچاوە عەرەبییانەی کەڵکیان لێ وەرگیراوە:**

- بەرپرسیاریتیی سزایی دەرکەوتوو لە ئەنجامی هەڵەی پزیشکییەوە، د. ماجد لافی، عەممان.
- بازرگانیکردن بە مرۆڤ، د. محەمەد موختار ئەلقازی، ئەسکەندەریە 2012.
- تاوانی بەکۆیلەکردن و بازرگانیکردن بە مرۆڤ بە پێی یاسا نێودەوڵەتییەکان و ڕێگەکانی بەگژداچوونەوەی، د. یوسف حەسەن یووسف، ئەسکەندەریە 2014.
- بازرگانیکردن بە مرۆڤ، م. هانی عیسەوی ئەلسیکی: توێژینەوەیەک بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلامی و هەندێک بنەمای یاسایی نێودەوڵەتی و نیشتیمانی، عەممان 2014.
- مامەڵە پێوەکردنی یاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، د. منذر الفضل، عەممان 1992.
- مامەڵەپێوەکردنی نایاسایی بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، د. حوسنی عۆدە زعال، توێژینەوەیەکی بەراوردکارییە، عەممان 1991.
- هەڵە پزیشکییەکان لە نێوان شەریعەت و یاسادا، د. عیسام مونیر عابدین، پەیمانگای توێژینەوە و لێکۆڵینەوە یاساییەکان، قاهیرە 2005.

- تاوانی بازرگانیکردن به مرۆڤ، دادوەر دکتۆر. ڕهام ئەکرەم عومەر، میسر 2011.
- تاوانەکانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ و ئەندامانی جەستەی مرۆڤ و سزاکانی لە شەریعەت و یاساکانی عەرەبی و یاسای نێودەوڵەتیدا، د. عەبدولقادر ئەلشێخلی، 2009.
- تاوانە نێودەوڵەتییەکان و دەسەڵاتی سزادانی ئەنجامدەرانی، د. عەبدلواحید محەمەد ئەلفار 1996.
- بازرگانیکردن بە دایکایەتی و فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، سەمیر غوبیە، قاهیرە - میسر 1999.
- بازرگانیکردن بە مرۆڤ لە نێوان ئابووریی شاراوە و ئابووریی فەرمیدا، ناشید سوزی عەدلی، ئەسکەندەریە - میسر 2005.
- گواستنەوەی ئەندامانی جەستە لە زیندوانەوە (توێژینەوەیەکی بەراوردکاری)یە، تاریق سرور، قاهیرە 2001.
- لێکەوتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی دیاردەی بازرگانیکردن بە مرۆڤ، عەبدولحافز عەبدولهادی، ڕیاز – سعوودیە، 2004.
- بنەماکانی گواستنەوە و چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە شەریعەتی ئیسلامیدا،

عەبدولحەمید ئیسماعیل ئەنساری، قاهیرە 2000.
- تاوانی فرۆشتنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ، ناسر بن مانع بن عەلی ئەل نهیان ئەلحەکیم، ڕیاز - سعوودیە 2005.
- نووسینگەی نەتەوە یەکگرتوەکان تایبەت بە ماددە هۆشبەرەکان و تاوان، کۆمەڵی میکانیزمەکانی بەگژداچوونەوەی بازرگانیکردن بە مرۆڤ، بڵاوکراوەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان، نیویۆرک 2010.
- المسؤوليه الجزائية عن الاتجار بالاعضاء البشرية- توێژەر: فاتمه صالح الشمالي.
زانکۆی (الشرق الاوسط) - MEU
کتێبە یاساییەکان:
- اكرم محمود البدو (2003)، لێپرسراوێتیی مەدەنیی نەخۆشخانە تایبەتییەکان، عەممان - ئوردوون.
- دعاء تيسير بكر (2008)، چاندنی ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە ڕێگەی خانە و جیناتەکان و حوکمەکانی لە شەریعەتی ئیسلامیدا.
- ابراهيم صادق الجندي (2001)، مردنی مێشک، ڕیاز - شانشینی سعوودیە.

- فخری الحدیثي، خالد الزغبی (2010)، شیکردنەوەی یاسای سزادان، بەشی گشتی، عەممان ئوردوون. – حسنی محمود نجیب (1975)، شیکردنەوەی یاسای سزادانی لوبنان، قاهیره – میسر.
- محمد سالم الحلبي (2009)، کورتەی بنەماکانی داگاییيە سزاییيەکان، عەممان – ئوردوون.
- پارێزەر (عمر ابو الفتوح) – 2011، بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەی مرۆڤ لە نێوان واقیع و یاسادت، قاهیره – میسر.
- احمد الرفاعي (1989)، یاسا تایبەتییەکان، عەممان – ئوردوون.
- مرکز الروابط للبحوث والدراسات الاستراتيجية
- ڤلادیمێر ماکیە - وەزیری دەرەوەی بیلاڕووسیا
iravelichko@gmail.com
http: tinyurl.com-kelly2013-organ-trafficking

## سەرچاوە ئینگلیزییەکان:


Ahmed.mustafa@ukgatewag.net

World Health organization ,Second Global Consultation on

critical issues in Human transplantation ;Towards a common

Attitude to Transplantation,Geneva,28-30March2007.p50.

World Health organization ,Second Global consultation on

Regulatory Requirements for Human cells and Tissues

Transplantation ,WHO ,Geneva ,79--june-2006.p30.

World health organization ,Second Global consultation on

critical issues in Human Transplantation ,opcit,p51.

http;\\www.who.int\transplantationlenl A57-R18-ar.pdf

http;\\daccess-dds-ny.org\doc\UN

Doc\GEN\N04\485\63\PDF\NO448563.
pdf?open Element http;\\daccess-dds-ny.
org\doc\UN
Doc\GEN\N04\485\63\PDF\NO448563.
pdf?open Element
http;\\conventions.coeint\treaty\FR\
treaties\htmi\186.htm
http://rawabetcenter.com/archives/37034
http://www.snnc.co/News.
aspx?id=22196&MapID=1